🕮 ناوی کتێب : بەهەشت لە قورئان و فەرموودە صەحیحەکاندا

✍ نووسینی : محمد ملا فائق شارەزووری.

❁ ژمارەی لاپەڕە: ٢٣٢

❁ نۆرەی چاپ: یەکەم

❁ ژمارەی تیراژ: ٢٠٠٠

❁ ساڵی چاپ : ١٤٣٠ هـ - ٢٠٠٩ م .

❁ ژمارەی سپاردن: (١٩٥)


**تێبینی:**

**بۆ دەست کەوتنی ئەم بەرهەمە بە(کۆ) پەیوەندی بکە**

**بەم ژمارە مۆبایلەوە: ٠٧٧٠١٥٥٤٠٨٥**

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

**إن الحمد لله ، نحمده ونستعينه ونستغفره ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له ،وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك لَهُ ، وَ أَشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَ رَسولُهُ .**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ (آل عمران :١٠٢).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ (النساء /١).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ (الأحزاب :٧٠-٧١).

**أمّا بعد فإنَّ أصدَقَ الحديثِ كتابَ الله وَ خَيرُ الهَدي هَديُ محمد (ﷺ) وَ شَرَّ الأمورِ مُحدَثاتُها ، وَكُلَّ مُحدَثةٍ بِدعة ، وَ كُلَّ بِدعَةٍ ضَلالة وَ كُلَّ ضَلالةٍ في النّار*.**

وە پاشان :

پێویستە لەسەر موسوڵمان پێش هەموو شتێك ئیمان و باوەڕ خۆی بناسێت لە ڕێگەی كار كردنی بەسوننەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ پەروەردەكردنی نەوەیەكی ئیسلامی نوێ ، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمان وبیرو باوەڕی فێری هاوەڵەكانی دەكرد پێش ئەوەی قورئانیان فێربكات وەكو هاوەڵی بەڕێز جوندوبی كوڕی عەبدولاّ ﷺ دەفەرموێت :

**" كنا مع النبيُّ ﷺ ونحن فتيان حزاورة ، فتعلمنا الإيمان قبل أن نتعلم القرآن ، ثم تعلم القرآن فازددنا به إيماناً ".**[1] واتە: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووین ﷺ وەئێمە گەنجانێكی تازە پێگەیشتوو ووریا و ژیر بووین فێری باوەڕ دەبووین لەپێش ئەوەی كە فێری قورئان ببین پاشان قورئان فێردەبووین و باوەڕمان زیاتر دەبوو پێی.

---

* ئەمە پێی دەوترێت (خطبة الحاجة) كە هەمیشە پێغەمبەر (ﷺ) ووتارەكانی بەمە دەست پێ دەكرد.وە بۆ زیاتر ڕوون كردنەوە سەیری كتێبی (خطبة الحاجة) بكە لاپەڕە (١٤ـ ١٩) كە شەش لە هاوەڵەكانی پێغەمبەر (ﷺ) گێڕاویانەتەوە.

[1] أخرجه: ابن ماجة في ((سنن)) (٦١) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) برقم (٥٢).

وە هەروەها ئیبن عومەر ﷺ دەفەرموێت : " لقد عشنا برهة من دهرنا ، وأحدنا يؤتى الايمان قبل القران ، وتنزل السورة على محمد ﷺ فنتعلم حلالها وحرامها وامرها وزاجرها ومايبنغي ان يقف عنده منها ... ثم لقد رأيت اليوم رجالاً يؤتى احدهم القران قبل الايمان ، فيقرأ مابين فاتحته الى خاتمته ، مايدري ما امره ولا زاجره ولا ما ينبغي أن يقف عنده فينثره نثر الدقل " (٢)

واتە: زەمانێکمان بردە سەر و تیایدا ژیاین ئێمە هەر یەکێکمان ئیمانمان وەر دەگرت پێش ئەوەی قورئان فێر ببین ، وە ئایەت دەهاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ حەڵاڵ وحەرام و فەرمان و قەدەغەکان وە ئەوەی پێویست بوایە فێر دەبووین ، بەڵام ئەمڕۆ دەبینم پیاوانێك قورئان فێردەبن پێش ئەوەی ئیمان فێربن ، یەکێك لە وانە لەسورەتی (الفاتحة)ەوە دەیخوێنێتەوە بۆ کۆتایی سورەتی (الناس) ، بەڵام بێ ئاگایە لەحەڵاڵ و حەرام کراوەکانی وە هەروەها فەرمانەکانی ئەوەتا قورئان هەڵدەڕێژێت وەك هەڵڕژاندنی قەسپە خورما.

بۆیە پێویستە لەسەر موسوڵمان ئیمان و ئەرکەکانی بە باشی فێر ببێت پێش هەموو شتێك ، وە یەکێك لە ڕووکنەکانی ئیمان باوەڕ هێنانە بە بەهەشت و دۆزەخ . چونکە زانست پێش قسە وکردەویە ، لەبەر ئەوە پێویستە بەهەشت بناسێت پاشان باوەڕ پێ بهێنێت ، وە زانایانی ئیسلام هەوڵ وکۆششیان کردووە بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتی بەهەشت وەکو ئەبو نەعیم و ئیبن و قەیم و چەندین زانای تر ...

وە پێم باش بوو لێکۆڵینەوەیەکی بابەتیانەی هەڵگۆزراو بکەم بۆ هەموو وورده کاریەکانی ئەم بابەتە گرنگە ئەویش بە چاو پیاخشاندنەوەی ئایەتە پیرۆزەکان و فەرموودە ((صحيح))ەکان کە لەکتێبی ((السنن)) و ((المسانيد)) و ((الجامیع)) دا هاتووە ، وە هەروەها بە چاو پیاخشاندنەوە بە سەرچاوەی دەرهێنانی فەرموودەکان وە پشت بەستن بە ووتەی زانایانی فەرموودەناس دەربارەی ڕاستێتی فەرموودەکە کە دەهێنرێتەوە بە بەڵگە بۆ جێگیر کردنی مەسەلەیەکی دیاریکراو ، لێرەدا زۆر هەوڵ درا بۆ ئەوەی بابەتەکە پاك و پوخت بێت ئەویش

---

(٢) أخرجه : الحاكم في ((المستدرك)) ( ٣٥/١ ) ، وصححه على شرط الشيخين ووافقه الذهبي ، والبيهقي في ((السنن الكبرى)) ( ٣/ ١٢٠ ).

لەڕێگەی کۆکردنەوەی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودە ڕاستەکانی پێغەمبەر ﷺ کە لەو بارەیەوە هاتووە بە بێ قسەکردن تیایدا ، مەگەر ئەوەی پێویست بێت ڕوون بکرێتەوە لە ووشە نامۆکاندا یان ڕاڤەی فەرموودەکان یاخود لێکدانەوەی ئەو مانایانەی کە ئالۆزن بۆ ئەوەی موسوڵمان شارەزابی و تێڕوانینێکی تەواوی هەبێت بە واتای بابەتەکە ، وە پێم باش بوو ئەو ((کردارە چاکانە)) کۆ بکەمەوە کە دەبێتە هۆیەك بۆ ئەوەی خاوەنەکەی بکاتە بەهەشتەوە .

وە سەرەتایی لێکۆڵینەوەکەم بە ((پێناسەی بەهەشت)) دەست پێ کرد پاشان ناوەکانی و جێگەکەی و بۆنەکەی و فراوانی یەکەی وە چۆنێتی چوونە ژوورەوەی باوەڕداران بۆ ناو بەهەشت، وەقسە کردنی بەهەشت ، وەچونێتی باخ و باخاتەکانی .. .هتد .

وەکۆتایی بابەتەکەم بە باس کردنی ئەو کارە چاکانە هێناوە کە هۆکارن بۆ چوونە ناو بەهەشت . داوا لە خوای گەورە دەکەم کە ئەم نوسینەم بە چاك بگێڕێت وە تەنها لەبەر خاتری ئەو بێت ، وە داوا دەکەم ڕێنمویی و بەردەوامی و زاست ڕەوانیمان پێ ببەخشێت وە بەو زانستەی کە فێری کردوین کەڵکمان پێ ببەخشێت (آمین).

# پێناســـەی بەهەشـــت

ئیبنو قەیم (رحمه الله) دەفەرمووێت : " الجنـة هـو الاسـم العـام المتنـاول لتلـك الـدار و مـا اشتملت عليه من أنواع النعيم واللذة والبهجة والسرور وقرة الاعين ، وأصل اشتقاق هـذه اللفظة من الستر و التغطية و منه الجنين لاستتاره في البطن ، و الجانّ لاستتارهِ عن العيـون ، والمِجَنْ لستره ووقايتهِ الوجه ، والمجنون لاستتار عقلهِ و تواريـه عنـه ، والجـانّ وهـي الحيّـة الصغيرة الرقيقة ، ومنه سمّي البُستانَ جنّة لآنه يستر داخلـه بالاشـجار و يغطيـه "[٣]. واتـه: ناوێکی تایبەتە بۆ ئەو جێگە پڕ کامەرانی وخۆشی یە کە خوای گـەورە ئامـادەی کـردووە بـۆ پیاوچاکانی خۆی ، وە بنچینەی ووشەکە وەرگیراوە لەواتای داپۆشـراو شـاراوە ، وەکـو (جـنین) واتە: (کۆرپەلە) کە شاراوەیە لەسکی دایك دا ، وە هەروەها ووشەی (جن) کەلە چاو شـاراوەیە وە (مجنون) (واتە: شێت) کە عەقڵی داپۆشراوە وەبە (بستان) (واتە: باخ) دەوترێت (جَنة) (واتە: بەهەشت) چونکە هەموو لایەکی لەناوەوە داپۆشراوە بە دار و درەخت ) .

# ناوەکانی بەهەشت

١- **دار السلام :** (واتە: جێگەی بێ ترس و ئارامی ) وەکو خوای گـەورە دەفـەرمووێت : ﴿لَهُمْ دَارُ ٱلسَّلَـٰمِ عِندَ رَبِّهِمْ ۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٧﴾﴾ (الأنعام: ١٢٧)

٢- **جنة الخلد :** (واتە : بەهەشتی نەبڕاوە و هەتا هـەتا )خـوای گـەورە دەفـەرمووێت : ﴿قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ ٱلْخُلْدِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۚ كَانَتْ لَهُمْ جَزَآءً وَمَصِيرًا ﴿١٥﴾﴾ (الفرقان: ١٥ )

٣- **جنات النعيم :** (واتە: جێگە و باخاتی پڕ نیعمەت) خوای گـەورە دەفـەرمووێت :﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَـٰهُمْ جَنَّـٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٦٥﴾﴾ (المائدة: ٦٥ )

---

[٣] ابن القيم الجوزية في ((مختصر حادي الارواح)) (ص: ٨٢ ) .

٤- **جنات عدن :** (واتە: باخەکانی جێگەی (عدن) ) خـوای گـەوره دەفـەرمویت: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٧٢﴾ ﴾ (التوبة: ٧٢ ) .

٥- **جنات الفردوس:** ( واتە: باخەکانی جێگەی (فردوس) ) خوای گەوره دەفەرمویت:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ ﴾( الكهف: ١٠٧) .

٦- **جنات المأوى:** (واتە: جێگە و باخەکانی حەوانەوە) وەکوخوای گەورەدەفـەرمویت :﴿ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ (السجدة: ١٩) .

٧- **دار المتقين:** (واتە: جێگەی خۆپەرێزان) خوای گـەوره دەفـەرمویت:﴿ وَقِيلَ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ مَاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۚ قَالُوا۟ خَيْرًا ۗ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۚ وَلَدَارُ ٱلْءَاخِرَةِ خَيْرٌ ۚ وَلَنِعْمَ دَارُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ (النحل: ٣٠)

٨- **دار المقامة :** (واتە: جێگەی نیشتەجێ و ئارامی ) خوای گەورەدەفەرمویت: ﴿ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ ۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِىٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ ﴿٣٥﴾ ﴾( فاطر: ٣٤ – ٣٥ ) .

٩- **المقام الامين:** (واتە: جێگەی مانەوەی بێ ترس) خوای گەوره دەفەرمویت:﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ ﴾( الدخان: ٥١)

١٠-**المقعد الصدق:** (واتە جێگەی ڕاستی و ڕاستگۆیان) خـوای گـەوره دەفـەرمویت :﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِى مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍۭ ﴿٥٥﴾ ﴾ (القمر: ٥٤ – ٥٥).

# ئامادە کردنی بەهەشت

خوای گەورە بەهەشتی لەگەڵ دروست کردنی زەوی وئاسمانەکاندا دروست کرد پێش دروست کردنی ئادەم ﷺ و ئامادەکراوە بۆ جێبەجێ کارانی فەرمانی کانی خوا، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَسَارِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾( آل عمران: ١٣٣). وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((**لّما خلق الله الجنة والنار أرسل جبريل الى الجنة فقال : اذهب فانظر اليها و الى ما اعددت لاهلها فيها**)) [٤] .

واتە: ((دوای ئەوەی خوای گەورە بەهەشت و دۆزەخی دروست کرد جبریلی ﷺ نارد بۆ تەماشا کردنی ناو بەهەشت وپێی فەرموو : برۆ سەیری بکە و تەماشا بکە چیم ئامادە کردووە بۆ خاوەنەکانی...)) . وەلە ڕیوایەتێکی تردا : ئەنەسەی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((**ثم انطلق بي جبريل حتى انتهى الى سدرة المنتهى فغشيها الوان لا أدري ماهي ؟ قال : ثم دخلت الجنة فاذا فيها جنابذ* اللؤلؤ و اذا ترتبها المسك**))[٥]. واتە: ((لەگەڵ جبریل دا بە ڕێکەوتین تا گەیشتینە جێگەی (**سدرة المنتهى**) کۆمەڵە ڕەنگێك داپۆشی بوو نەم دەزانی چی یە ؟ ئەنجا چوومە ناو بەهەشتەوە تەماشام کرد قوبەو گومەزی مرواری لێ یە ، وە خاکەکەی بۆنی خۆشی میسك بوو)). وە کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((**انَّ نسمة* المؤمن طائر يعلق في شجر الجنة حتى يرجع إلى جسده يوم يُبعث**)) [٦]. واتە: ((ڕۆحی بڕوادار وەکو باڵندەیەك وایە

---

[٤] أخرجه : أبو داود ((السنن)) (٤٧٤٤) ، والنسائي((السنن)) (٢/٣) ، والترمذي ((السنن)) (٢٥٦٠)، واحمد ((المسند)) (٣٣٣/٢) ، وقال الحافظ ((فتح الباري)) ( ٦/ ٣٦٩) : إسناده قوي ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترمذي)) (٢٠٧٥) ، وفي ((صحيح النسائي)) (٣٥٢٣) وفي ((المشكاة)) (٥٦٥٩) عن أبي هريرة مرفوعاً .

* جنابذ : أي القباب .

[٥] أخرجه : الإمام البخاري ((الصحيح)) (٣٤٩) ، ومسلم ((الصحيح)) (٢٦٣) .

* النسمة : أي الروح .

[٦] أخرجه : مالك ((الموطأ)) (٢٤/١) ، والنسائي (١٠٨/٤) ، وابن ماجة ((السنن)) (٤٢٧١) ، وصحّحه الشيخ الألباني في ((صحيح النسائي)) (١٩٦٠) ، وفي ((صحيح ابن ماجة)) (٣٤٤٦) ، وفي ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٩٩٥) ، وفي ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٥٢٩) .

بە درەختەکانی بەهەشتەوە چلاو چل دەکات و دەنۆشێت تاکو ئەو ڕۆژەی دەگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی لە ڕۆژی زیندوبوونەوەدا)).

## بەهەشت لەکوێدایە ؟

بەهەشت لەسەرو ئاسمانی حەوتەمەوەیە لەژێرعەرش دا لای (سیدرة المنتهى ) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ ﴾ (النجم: ١٤-١٥) (واتە: بەهەشت لای (سیدرة المنتهى) یە کە لەوێدا بەهەشتی (مأوى) هەیە کە جێگەی حەوانەوەیە....) .

وەهەروەها دەفەرموێت : ﴿ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿٢٢﴾ ﴾( الحاقة: ٢٢ ) واتە: بەهەشتی زۆر بەرزی سەروئاسمانەکان.

وەهەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوڕەویەکەیدا بەرز کرایەوە بۆ ئاسمانی حەوتەم پاشان بۆ ( سدره المنتهى ) پاشان بۆ بەهەشت : پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((.... **ثم عُرِجَ بنا الى السماء السابعة فاستفتح جبريل ... ثم ذهب بي الى السدرة المنتهى**)) [٧] واتە: .... بەرەو ئاسمانی حەوتەم کەوتینە ڕێ و جبرەئیل داوای کردنەوەی دەرگاکەی کرد .......... پاشان بەرێکەوتین بۆ ( سدرة المنتهى ))).

## بۆنی بەهەشت

بۆنی خۆشی بەهەشت بە پێی ماوەکان جیاوازیان هەیە ئەوەش بە هۆی بەرزونزمی پلەی باوەڕدارانەوەیە لە ڕۆژی کۆتایدا (والله اعلم) عەبدولای کوڕی عومەرﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرە ﷺ کە فەرموویەتی:

((**من قتل نفساً معاهداً لم يرح رائحة الجنة وان ريحها ليوجد من مسيرة أربعين عاما**))[٨].

واتە: ((هەر کەسێك کەسێکی ((**معاهد**)) [واتە: ئەو جولەکە و گاورەی لەناو موسوڵماناندا دەژین و سەرانە دەدەن ] بکوژێت ئەوا بۆنی بەهەشت ناکات ، وە بۆنەکەی هەست پێ دەکرێت لە دووری ماوەی چل ساڵ)).

---

[٧] أخرجه : مسلم ((الصحيح)) (٢٦٣) .

[٨] أخرجه: البخاري ((الصحيح)) ( ٣١٦٦) .

وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : ((وان ریحها لتوجد من مسیرة سبعین عاماً))[٩]. ((واتە: بۆنەی بەهەشت هەستی پێی دەکرێت لە دووری حەفتا ساڵ)). وەلە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((من قتل نفسا معاهدة بغیر حقها ، لم یرح رائحة الجنة ، وان ریح الجنة لیوجد من مسیرة مئة عام)) [١٠]. واتە: ((هەر کەسێك نەفسێکی ((معاهد)) بەناهەقی بکوژێت بە بێ ئەوەی حەقێکی لا بێت ، ئەوا بۆنی بەهەشت ناکات وە بۆنی بەهەشت هەست بەبۆنی دەکرێت لە دووری سەد ساڵ)) وەلەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : ((من قتل معاهدا* في عهده لم یرح رائحة الجنة ، و ان ریحها لیوجد من مسیرة خمس مئة عام)) [١١]..واتە: ((هەر کەسێك (معاهد) ێك بکوژێت بۆنی بەهەشت ناکات وە بۆنەکەی هەستی پێ دەکرێت لە دووری پێنج سەد ساڵ)).

# فراوانی بەهەشت

خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە پانتایی بەهەشت بە ئەندازەی پانتایی وفراوانی ئاسمانەکان و زەویەکانە وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣﴾( آل عمران: ١٣٣) ، وەهەروەها پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە کەلە بەهەشت دا سەد پلە هەیە وەهەر پلەیەکی بەئەندازەی نێوانی ئاسمان و زەویە ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((ان في الجنة مائة درجة ... ما بین الدرجتین کما بین السماء والارض)) [١٢]. واتە: ((لەناو بەهەشت دا سەد پلە هەیە ... لەنێوانی هەر دوو پلەیەکدا وەك

---

[٩] أخرجه: النسائي ((السنن)) (٢٥/٨) ، والترمذي ((السنن)) (١٤٠٣) وقال : حسن صحیح ، وابن ماجة ((السنن)) (٢٦٨٧) ، وصححه الشیخ الألباني في ((صحیح الترمذي)) ( ١١٣٢) ، وفي ((صحیح ابن ماجة)) (٢١٧٦) ، وفي ((سلسلة الأحادیث الصحیحة)) (٢٣٠٧) .

[١٠] أخرجه: ابن حبان في ((الصحیح)) (٧٣٨٢) وقال محققه : إسناده صحیح علی شرط البخاري ، وصححه الشیخ الألباني في ((سلسلة الأحادیث الصحیحة)) (٢٣٥٦).

* معاهداً : أي الذي یعطي الجزیة من اهل الکتاب .

[١١] أخرجه : احمد ((المسند)) (٥٠/٥) (٢٠٥٠٦) وقال محققه : حدیث صحیح ، وابن حبان ((الصحیح)) (٧٣٨٣) وقال محققه : حدیث صحیح ، والحاکم ((المستدرك)) (٤٤/١) وصححه علی شرط مسلم ووافقه الذهبي ، وصححه الشیخ الألباني في ((صحیح الجامع)) (ترتیب ١٠٥/٣رقم (٥) ).

[١٢] أخرجه : البخاري ((الصحیح)) (٢٧٩٠) .

نێوانی ئاسمان و زەوی وایە)). وەفراوانی بەهەشت لەگەورەیی دەرگاکانی ، وکۆشك وتەلار و درەختەکان و بەرو بووەمەکانی دا دەردەکەوێت :

لەئەبی سەعیدی خدریەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((ان مابين المصراعين* في الجنة مسيرة أربعين سنة))** [١٣]. واتە:(( لە نێوانی ئەم لا و لای تاکە دەرگایەکی بەهەشتدا ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی چل ساڵە)). وەلەئەبی موسای ئەشعەریەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((ان للمؤمن في الجنة لخيمة من لؤلؤة واحدة مجوفة* طولها – في رواية – : عرضها – ستون ميلاً ..))** [١٤]. واتە: خاوەن باوەڕ خێمەیەکی هەیە لە مرواریەکی ناو بۆش درێژیەکەی ( واتە: بەرزیەکەی) - لەڕیوایەتێکی تردا - پانتایەکەی - شەست میلە....)) واتە: نزیکەی (١٠٠کم) دەبێت.

وە ئەبو هورپیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی : **(( ان في الجنة لشجرة يسير الراكب في ظلها مائة عام))** [١٥]. واتە.((لەناو بەهەشت دا درەختێك هەیە ئەسپ سواری تیژڕەو ماوەی سەد ساڵ لەژێر سێبەرەکەیدا دەڕوات تەواو نابێت)).

ئەنەس ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی : **((رفعت لي سدرة المنتهى فاذا نبقها مثل قلال* هجر ، و اذا ورقها مثل اذان الفيلة))** [١٦]. ((واتە: ( **سدره المنتهى**)م نیشان درا بینیم گەڵاکانی بە ئەندازەی گوێچکەی فیلێك دەبوو وە بەروبومەکەی وەکو کوپەڵە گەورەکانی ناوچەی ( هەجەر ) دەبوو)).

لەڕیوایەتەکەی عوتبەداﷺ دەفەرموێت : **((قام أعرابي إلى رسول الله ﷺ فقال : فيها عنب – ( يعني في الجنة ) يارسول الله ؟ قال : ((نعم)) ، قال : ما عظم العنقود منها؟ قال :**

---

* المصراعين : أي جانبي الباب .

[١٣] أخرجه : احمد ((المسند)) (٣/٢٩) ، وصححه الشيخ الألباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (١٦٩٨) وفي ((صحيح الجامع)) (٣١٩٠) .

* مجوفة : أي مفرغة من الداخل .

[١٤] أخرجه : مسلم ((الصحيح)) (٢/٥٣٤) .

[١٥] أخرجه: أحمد ((المسند)) ( ٢/٤٨١) ، والحميدي ((المسند)) (١١٣١) ، والبخاري ((الصحيح)) (٤٨٨١) .

* قلال : الجرار .

[١٦] أخرجه : البخاري ((الصحيح)) ( ٣٢٠٧) .

((**مسيرة شهر للغراب الابقع لاينثني ولايفتر** ))[١٧]. واتە: لادێی یەك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی ووت : ئەی پێغەمبەر: ئایا لەناو بەهەشت دا ترێ هەیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ((بەڵێ)) پاشان ووتی هێشوەکانی چەندە گەورەیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ((هێشوویەکی بەقەد ماوەی یەك مانگ فڕینی قەلەڕەشێکی پەڵاویە لەم سەرەوە بفڕێت بۆ ئەو سەر بە بێ وەستان)).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((**يكون في النار قوم ماشاء الله ثم يرحمهم الله ، ثم يخرجهم... لوطاف بأحدهم أهل الدنيا لاطعمهم وسقاهم وفرشهم لاينقص ذلك مما عنده**))[١٨]. واتە: ((کەسانێك لەناو ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە تاکو خوای گەورە ویستی لێ بێت ، پاشان ڕەحمیان پێ دەکات و لەناو ئاگر دەریان دەکات ... (واتە یەکێك لەوانەی کە لەئاگری دۆزەخ هێنراونەتەدەر و چوونەتە ناو بەهەشت) گەر هەموو کەسانی دونیا ببنە میوانی یەکێك لەوان دەتوانێت خواردن و خواردنەوە و جێگەیان پێ ببەخشێت بێ ئەوەی هیچ لە بەشەکەی خۆی کەم ببێتەوە)) .

وەفراوانی بەهەشت بە ئەندازەی نیعمەتەکانی دەردەکەوێت ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردۆتەوە کە یەکەم خواردنێك پێشکەش دەکرێت بە یەکەم تاقمی ئەهلی بەهەشت جگەری حوت وگایە کە حەفتا هەزار کەس لێ ی دەخوات .

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((...**ثور و نون يأكل من زيادة كبدهما سبعون ألفاً**))[١٩] . واتە: ((یەکەم خواردنیان خواردنی زیادەی جگەری حوت و جگەری گایە کەحەفتا هەزار لێی دەخوات ..)). بەهەشت زۆر فراوان و گەوریە ، ئەوەتا ئەو کەسەی کە لە نزمترین پلەی بەهەشتدا یە دە ئەوەندەی موڵکی هەموو دونیای پێ دەدرێت کە پانتایەکەی بەقەد ماوەی سەد ساڵە بە چاوی خۆی دەیبینێت . پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((... **فيقول ((الله تعالى)): الم ترض إن اعطيك مثل الدنيا منذ خلقتها الى يوم افنيتها وعشرة اضعافه ...فيقال له** :

---

[١٧] أخرجه : ابن حبان ((الصحيح)) ( ٧٤١٦) وقال محققه : إسناده قوى .

[١٨] أخرجه : ابن حبان ((الصحيح)) (٧٤٢٨) وقال محققه : إسناده قوى .

[١٩] أخرجه : البخاري ((الصحيح)) (٦٥٢٠) .

**اشرف ، قال : فيشرف* ، فيقال له : ملكك مسيرة مائة عام ، ينفذه بصرك ...))**. واتە: ((خوای گەورە دەفەرموێت : ئایا ڕازی نابیت ئەوەندی دونیات پێ ببەخشم لەو ڕۆژەی کە دروستم کردوە تا ئەو ڕۆژەی لە ناوم بردوە ، و دە ئەوەندەی ئەوەش ...وەپێی دەوترێت : بەرز بەرەوە ، دەفەرموێت : بەرز دەبێتەوە ، وەپێی دەوترێت : موڵکی تۆ ماوەی سەد ساڵ ڕێگەیە کە بە چاوی خۆت دەیبینیت ...))[٢٠]. وە گەورەیی وفراوانی بەهەشت زیاتر لەوەدا دەر دەکەوێت کە ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانانی بۆ ئامادە کراوە ، وەیەکەم تاقمی موسوڵمانان کە دەچنە بەهەشت حەفتا هەزار کەسن ، وەخوای گەورەش ئەوەی بەخشیوە بە ئومەتەکەی پێغەمبەری خۆمان ﷺ کە لەگەڵ هەر یەکێك دا حەفتا هەزاری تر بچێتە ناو بەهەشت .

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : **(( اعطيت سبعين الفاً [ من امتي ] يدخلون الجنة بغير حساب، وجوههم كالقمر ليلة البدر ، ... فستزدت ربي عزوجل فزادني مع كل واحد سبعين الفا))**[٢١]. واتە: ((خوای گەورە حەفتا هەزار کەسی لەئومەتەکەمی پێ بەخشیم کە بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت ڕوویان درەوشاوەیە وەك مانگی چواردە ، ... داوای زیاترم کرد لەخوای پەروەردگار ، وەئەویش لەگەڵ هەر یەکێك لەوانە حەفتا هەزار کەسی تری بۆ زیاد کردم کە بچنە ناو بەهەشت)). وەئەمە ( والله اعلم ) نزیکەی (٤,٩٠٠,٠٠٠,٠٠٠) چوارملیار ونۆسەدملیون موسوڵمان دەبێت ، لەگەڵ ئەوەش دا خوای گەورە بە تکای پێغەمبەر ﷺ چەندەهای زیاتر دەردەکات لە دۆزەخ و نیشتەجێ ی بەهەشتیان دەکات ، وە هەروەها بە تکای پێغەمبەران و فریشتەکان و شەهیدەکان و پیاوچاکان و موسوسڵمانان ژمارەیەکی زۆرتر دەچنە ناو بەهەشت ، وەهەروەها خوای گەورە بە ڕەحمی خۆی سێ مشت لە دۆزەخ دەردەکات و دەیانکاتە ناو بەهەشت.

---

* فيشرف : أي ينظر من اعلى البناء من الشرفة .

[٢٠] أخرجه : الطبراني ((المعجم الكبير)) ( ٩٧٦٣) ، والإمام الحاكم ((المستدرك)) (٣٧٦/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وعبد لله بن احمد في كتاب ((السنة)) (١٢٠٣) وقال محققه : إسناده حسن ، وصححه الشيخ الألباني في ((مختصر العقيدة الطحاوية)) ( ص: ٢٦٤) ، وفي ((مختصر العلو)) (٦٩) (ص : ١١٠) ، وصححه الشيخ شعيب الارناؤوط في ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٦٠٦/٢) .

[٢١] أخرجه : احمد ((المسند)) (٦/١)، وابو يعلى ((المسند)) (٣٧٨٣)، و صححه الشيخ الألباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (١٤٨٤) ، وفي ((صحيح الجامع)) (١٠٥٧) .

ئەبو ئومامەوە ﷺ گێڕاویتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((... وعدني ربي ان يدخل الجنة من امتي سبعين الفاً .. وثلاث حثيات من حثيات ربي ))[٢٢] . واتە: ((خوای گەورە بەڵێنی پێداوم کە حەفتا هەزار کەس لە ئومەتەکەم بکاتە ناو بەهەشتەوە ...لەگەڵ سێ مشت لەمشتەکانی خوای گەورە)) وە ئەو مشتانە - ان شاء الله — چەندەها کەس دەگرێتەوە کە لەژماردن وسەرژمێری کردن نایەن وە خوای گەورە نەبێت کەس نازانێت ژمارەیان چەند دەبێت. وەکو عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەفەرموێت : "ان الله قادر على ان يدخل الناس بحفنة واحدة "[٢٣] واتە: "خوای گەورە بەتوانایە کە بە یەك مشت هەموو خەڵکان بخاتە ناو بەهەشتەوە" . وە لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا بەهەشت پڕنابێت ، تاکو خوای گەورە کەسانێکی تری بۆ دروست دەکات ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((... ولايزال في الجنة فضل حتى ينشئ الله لها خلقا فيسكنهم فضل الجنة ))[٢٤] .واتە: ((بەردەوام لەناو بەهەشتدا چۆڵی هەیە تاکو خوای گەورە کۆمەڵە کەسانێکی بۆ دروست دەکات و نیشتەجێ یان دەکات و ئەو چۆڵی یەی بەهەشت بەوان. پێ پڕدەکاتەوە)).

## تکای پێغەمبەر ﷺ بۆ چوونە ژورەوەی خەڵکان بۆ ناو بەهەشت

دوای ئەوەی موسوڵمانان لە ئاوی حەوزی کەوسەر دەخۆنەوە ، چاوەڕوانن کەبچنە ناو بەهەشت کە لەبەردەمیاندایە و لە دوورەوە دەیبینن دەرگاکانی داخراوە ، وەخەڵکان مقۆ مقۆی ئەوەیانە هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیاندا کە کێ تکابکات و دەرگای بەهەشتیان بۆ بکاتەوە ، وەئەم داواکاریەی خەڵکان جێ بەجێ کردنەکەی دواجار دەگەڕێتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتکایان بۆ دەکات ، وەك لەم ڕیوایەتانەی خوارەوە داهاتووە دوای ڕێکخستنیان:

---

[٢٢] أخرجه : احمد إمام أهل السنة والجماعة في ((المسند)) (٥/٢٦٨) ، والترمذي ((السنن)) (٢٤٣٧) وقال : حسن غريب ، و ابن ماجة ((السنن)) (٤٢٨٦)، وجود إسناده ابن كثير ((تفسير القران العظيم)) (١/٥٥٨) من طريق الطبراني و ابن أبي عاصم ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترمذي)) (١٩٨٤) ، وفي ((صحيح ابن ماجة)) (٣٤٥٩) وفي ((سلسلة الأحاديث الأحاديث الصحيحة)) (٢١٧٩) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٧١١١) .

[٢٣] أخرجه : احمد ((المسند)) (١٣٠٠٧) (٣/١٩٣) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط : حديث صحيح إسناده حسن، وقال ابن حجر الهيثمي ((المجمع الزوائد)) (١٠/٤٠٤) رواه احمد والطبراني ((المعجم الأوسط)) بإسناد حسن .

[٢٤] أخرجه : البخاري ((الصحيح)) (٧٣٨٤) .

١- ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: **((یجمع الله تبارك وتعالى الناس ، فیقوم المؤمنون حین تزلف لهم الجنة ، فیأتون ادم ، فیقولون: یا ابانا استفتح لنا الجنة ، فیقول : وهل اخرجکم من الجنة الا خطیئة ابیکم لست بصاحب ذلك ))** [٢٥] . واتە: ((کاتێ خوای گەورە خەڵکان کۆ دەکاتەوە ، کاتێ باوەڕداران بەهەشتیان لێ نزیك دەکرێتەوە ، دەچن بۆلای ئادەم و پێی دەڵێن : ئەی باوکی هەموومان دەرگای بەهەشتمان بۆ بکەرەوە ، ئەویش دەفەرموێت: ئایا هەر هەڵەی باوکتان نەبوو کە ئێوەی لە بەهەشت دەرکرد ؟ نەخێر ئەو کارە بەمن ئەنجام نادرێت)).

٢- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کەفەرموویەتی: **((....ولکن أتوا نوحاً ، فیأتون نوحاً فیقول : اني دعوت على اهل الارض دعوة فاهلکوا ، ولکن اذهبوا الى ابراهیم ((خلیل الله)) فیأتون ابراهیم فیقول : ((لست بصاحب ذلك)) اني کذبتُ ثلاث کذبات)) ثم قال ﷺ : ((مامنها کذبة الا ماحلّ بها عن دین الله ، ولکن ائتو موسى ، فیأتون موسى فیقول : ((لست بصاحب ذلك)) : اني قد قتلت نفساً ، ولکن ائتوا عیسى ، فیأتون عیسى فیقول : ((لست بصاحب ذلك)) اني عُبدتٌ من دون الله ، ولکن ائتوا محمداً ))** [٢٦].

واتە: ئادەم دەفەرموێت : ((....بەڵام بچن بۆلای نوح ، ئنجا دەچن بۆلای نوح و پێیان دەفەرموێت: دوعایەکی وەهام کرد لە دانیشتوانی سەر زەوی تا هەموویان لەناو چوون ، بەڵام بچن بۆلای ئیبراهیم ((خۆشەویستی خوایە)) وەدچن بۆلای ئیبراهیم، وە ئەویش دەفەرموێت : ((من شایەنی ئەوە نیم)) من سێ درۆم کردوە پاشان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((هەر درۆیەك لەوانە تەنها لەبەر پارێزگاری کردنی بووە بۆئاینەکەی خودا)) بەڵام بچن بۆلای موسا ، ئەوان دەچنە لای موسا و ئەویش دەڵێت : ((من شایەنی ئەوە نیم)) من نەفسێکم کوشتووە بەڵام بچنەلای عیسا ئەوان دەچنەلای عیسا و ئەویش دەفەرمووێت : من جگە لە خوا پەرستراوم ، بەڵام بچن بۆ لای محمد)) . لەڕیوایەتێکی تردا : لەسەلمانەوە ﷺ دەفەرموێت : **((فیأتون النبي**

---

[٢٥] أخرجه : مسلم ((الصحیح)) (١٣٣) .

[٢٦] أخرجه : الترمذي ((السنن)) (٣١٤٨) وقال : حسن صحیح ، وصححه الشیخ الألباني في ((صحیح سنن الترمذي)) (٢٥١٦) وقال : صحیح .

ﷺ فيقولون : يانبـي الله انت الذي فتح الله لك ، وغفر لك ماتقـدم مـن ذنبـك وماتـأخر ، وقد ترى مانحن فيه فأشـفع لنـا الى ربـك ، فيقـول : أنـا صـاحبكم ، فيخـرج يجـوس بـين الناس))[٢٧] واتە: دەچنە لای پێغەمبەر ﷺ دەڵێن ئەی پێغەمبەری خـوا ، تـۆ خـوای گـەورە لەهەموو گوناهێکت خۆش بووە نابینی ئێمە لەچ حاڵێکداین تکامان بۆبکـە لای خـوای خـۆت ئەفەرموێت : من ئەو کەسەم ، وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : بـەڕێ دەکـەوم و ڕێـم بـۆ چـۆڵ دەکەن)). لەڕیوایەتەکەی عوبادەی کوڕی صامتەوەﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((... وان معي لواء الحمد أنا أمشي ويمشي الناس معي ، حتى اتي باب الجنة ))[٢٨] .واتە: ((من ئاڵای (حمد)م هەڵگرتووە وە دەڕۆم و خەڵکان لەگەڵمدا دێن، تاکو دەچمەی بەر دەرگای بەهەشـت)) . وە لەڕیوایەتەکەی ئەنەس داﷺ : دەفەرموێت : ((...... وأنا أول من يدخل الجنـة ولافخـر اخذ بحلقة باب الجنـة ... ))[٢٩].واتە: ((من یەکەم کەسـم کەدەچـمە نـاو بەهەشـتەوە بـەبێ شانازی و دەست بەئەڵقەی دەرگای بەهەشتەوە دەگرم وله درگادەدەم ...)).

له ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : [...فأقعِقُها ...][٣٠] واتە : دەی جوڵێنمـەوە و دەنگـی لێدانی دەرگاکە دێت .لەڕیوایەتێکی ترەوە لەئەنەسەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبـەر ﷺ کـە فەرموویەتی: [...فأستفتح ، فيقول الخازن : من انت ، [فـأقول محمـد] ، فيقـول ((مرحبـا بمحمد)) ][٣١] واتە: داوای دەرگا کردنەوە دەکەم ، وە دەرگاوانی بەهەشت دەڵێـت : تـۆ کێـت؟ منیش دەڵێم : محمدم ، ئەویش دەڵێت : ((پێشوازی بێت لەمحمـد)). ((بـك أمـرت ان لا افـتح لاحد قبلك ))[٣٢]. واتە: ((فەرمانم پێکراوە کە یەکەم جار دەرگا لە تۆ بکەمەوە و پێش تۆ لە هیچ کەسێکی تری نەکەمەوە)) .لەڕیوایـەتێکی تـردا دەفـەرموێت : ((......فيفتتحـون لـي

---

[٢٧] أخرجه : الطبراني ((الكبير)) رقم : (٦١١٧) ، والهيثمي ((المجمع)) (٣٧٢/١٠) : رجاله رجال الصحيح ، وابن أبي عاصم ((السنة)) (٨١٣) ، وقال محققه الشيخ الألباني : إسناده صحيح على شرطهما وهو في حكم المرفوع .

[٢٨] في رواية : الحاكم (٣٠/١) صححه على شرطهما ووافقه الذهبي .

[٢٩] في رواية : احمد (١٤٤/٣) ، وقال الشيخ الالباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (١٥٧١)، إسناده جيد .

[٣٠] في رواية: الترمذي (٣١٤٨).

[٣١] في رواية : الحاكم (٣٠/١).

[٣٢] في رواية : مسلم (١٣٣).

**ويرحبـون بـي فيقولـون مرحبـاً ...))** [٣٣] .واتـە.((...دەرگاکـەم بۆدەکەنـەوە و پێـشوازی وبەخێرهاتنم دەکەن ...)) .

لە ڕیوایەتێکی تردا لەئەبی هورەیرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویـەتی: ((**فانطلق فآتي تحت العرش** ...))[٣٤]. واتە: ئنجا بەرێ دەکەوم تا دەچمە ژێر عـەرش ...)) .

وەلەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((...... **فيقيمني رب العالمين منـه مقامـاً لم يقمه أحداً قبلي ولم يقمه أحدا بعدي** ... )) [٣٥] واتە: ((خوای پـەروەردگار دەموەسـتێنێت لە جێگەی وەستانێکدا و پلەو پایەیەکم پێدەبەخشێت کە لەپێش مندا بەکەسی نەبەخـشیوە وە نایبەخشێ بەکەسی تریش لەدوای من ...)) .

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : ((...**فاستاذن على ربـي ويـؤذن لـي**...)) .واتـە: ئیـزن لەپەروەردگار وەردەگرم ئەویش ئیزنم دەدات ((...**فيستقبلني وجـه الجبـار جـل جلالـه**)) [٣٦]. واتە: ((وە بە ڕوخساری خوای گەورە لە ڕوومدا شـاد دەبم)).((و کـاتێ کـە دەیبینـم یەکـسەر دەچمە سوجدە بردن بۆ خوا))[٣٧].لەڕیوایەتێکی تردا: (( ... **لربي ثم يفتح الله علي ويلـهمني من محامده وحسن الثناء عليه شيئً لم يفتحه لآحد قبلـي**))[٣٨].واتـە: ((پاشـان خـوای گـەورە سوپاس وستایشێکم نیشان دەدات کە نیشانی کەسی تری نەداوە لەوەو پێش )) .لەڕیوایەتێکی تردا ئەنەس ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ((...**فيدعني مـا شـاءالله ان يدعني ثم يقال**...))[٣٩] واتە: ((خوای گەورە وازهێنانێك وازم لێ دەهێنێـت تـا ئـەو کاتـەی خۆی ویستی لێ بێت ، پاشان دەوترێت ...)). ((**يا محمد ارفع رأسـك وقـل تـسمع ، وسـل تعطه، واشفع تشفع ، فارفع راسي فأقول : يارب أُمتي أُمتي ، فيقال : يا محمد ادخـل الجنـة من امتك من لاحساب عليهم من الباب الايمن من أبواب الجنـة وهـم شـركاء النـاس فيمـا**

---

[٣٣] في رواية : الترمذي (٣١٤٨).

[٣٤] في رواية : مسلم (١٣٣).

[٣٥] في رواية : ابن حبان (٦٤٦٥).

[٣٦] في رواية : الإمام احمد (٣/١٤٤) رقم (١٢٤٦٩)، و قال محققه الارناؤوط :السنده جيّد.

[٣٧] في رواية : مسلم (١٢٧) .

[٣٨] في رواية : مسلم (١٣٣ ).

[٣٩] رواية : ابن حبان (٦٤٦٤) وقال محققه : إسناده صحيح على شرط مسلم .

سوى ذلك من الابواب .. )) [٤٠]. واتە: ((ئەی محمد سەرت بەرز بکەرەوە و قسە بکە تا قسەکانت ببیسترێت و داوا بکە تا پێت ببەخشرێت وە داوای تکا کردن بکە تا تکاکردنت لیّ وەربگیرێت ، منیش سەر بەرز دەکەمەوە و دەڵێم : ئەی پەروەردگار ئومەتەکەم ئومەتەکەم ، پێم دەوترێت ئەی محمد : ئەوانەی کە لێپرسینەوەیان لەسەر نیە لە ئومەتەکەت بیان کەرە ژوورەوەی بەهەشت لە دەرگای لای ڕاستی دەرگاکانی بەهەشت وە ئەوان بەشدارن لەگەڵ خەڵکاندا لە چوونە ژوورەوە لە دەرگاکانی تری بەهەشتەوە)) .

## خەڵکان چۆن دەچنە ناو بەهەشت

خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت دا خەڵکان بە ڕووت وقوتی زیندوودەکاتەوە وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((یحشر الناس یوم القیامة حفاة عراة غرلاً ...)) [٤١] . واتە: ((خەڵکان لەڕۆژی قیامەتدا پێ پەتین و بە ڕووت و قوتی کۆ دەکرێنەوە ...)). وەیەکەم کەس کە خوای گەورە پۆشاکی بەبەردا دەکات ، خۆشەویستی خوا ئیبراهیمە ﷺ . لەئیبن و عەباسەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (( ان أول الخلائق یکسی یوم القیامة ابراهیم خلیل الله)) [٤٢]. واتە: ((یەکەم کەسێك کەلەقیامەت دا پۆشاکی بە بەردا دەکرێت خۆشەویستی خوا ئیبراهیمە)). وەخوای گەورە پۆشاکێکی سپی قیبطی بە بەردا دەکات .لە ئیمامی عەلی یەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((اول من یکسی ابراهیم قبطیتین)) [٤٣] واتە: ((یەکەم کەس کە پۆشاکی بە بەردا دەکرێت ئیبراهیمە پۆشاکێکی سپی قیبتی بە بەردا دەکرێت)). ئنجا خوای گەورە پێغەمبەر ﷺ پۆشتە دەکات. لەکەعبی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( یبعث الناس یوم القیامة فاکون انا وامتي علی

---

[٤٠] في روایة : مسلم (١٣٣) .

[٤١] أخرجه : البخاري (٣٣٤٩) .

[٤٢] أخرجه : البخاري ((فتح الباري)) (٣٧٧/١١) .

[٤٣] أخرجه : ابو یعلي ((المسند)) (١٦٥/١) باسناد صحیح علی شرط مسلم – کما قال الشیخ الألباني في ((مختصر العلو)) (ص: ١٢٥).

تل فيكسوني ربي حلة خضراء...))[٤٤]. واتە: ((خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت دا خەڵکان زیندوو دەکاتەوە لەوێ من و ئومەتەکەم لەسەر گردۆڵکەیەکین وە پۆشاکێکی سەوزم بە بەردا دەکات ...)) .

لەڕیوایەتێکی تردا : ((...حمراء...)) واتە:((پۆشاکێکی سورم بە بەردا دەکات ...)) [٤٥] ، وەلەو موسوڵمانانەی کەپۆشاکی ئیمانیان بە بەردا دەکرێت وەکو لەم فەرموودەیەدا هاتووە : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((من ترك اللباس تواضعاً لله وهو يقدر عليه دعاه الله يوم القيامة حتى يخيره من أي حلل الايمان شاء يلبسها)) [٤٦]. واتە: ((هەر کەسێك واز لە جل وبەرگی (گران بەها) بهێنێت لەبەر خۆبەکەم زانین بۆ خوای گەورە، ئەو کەسە خوای گەورە بانگی دەکات لە ڕۆژی کۆتایدا و سەرپشکی دەکات لە هەڵبژاردنی کام بەرگ و پۆشاکی ئیمان کە خۆی ویستی لێیەتی تا لەبەری بکات)). وەئیمامی تورمزی لە(سوننەکەیدا) دەفەرموێت: ((يعني مايعطى اهل الايمان من حلل الجنة)) [٤٧] واتە : ((لەوانەی کە دەبەخشرێت بەباوەڕداران لەپۆشاکی ئەهلی بەهەشت )) . وەهەندێ لەبڕواداران پۆشاکی ڕێزیان بە بەردا دەکرێت وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((... ما من مؤمن يعزى اخاه بمصيبة الا كساه الله سبحانه من حلل الكرامة يوم القيامة)) [٤٨] . واتە: ((هەر باوەڕدارێك دڵنەوایی برایەکی موسوڵمانی بداتەوە لەناخۆشیەکدا ئەوا بە دڵنیای خوای گەورە پۆشاکی ڕێزی بە بەردا دەکات لەڕۆژی قیامەت دا)) . لەڕیوایەتێکی تردا : ((حَلة خضراء يُصبر بها)) [٤٩] . واتە: ... پۆشاکێکی سەوزی بەبەردا دەکرێت و دەکرێتە خەلاتی )).

---

[٤٤] أخرجه : ابن حبان (٦٤٤٥) ، والحاكم (٣٦٣/٤) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي ، وأحمد (٤٥٦/٣) ، والطبراني ((الكبير)) (١٤٢/١٩) ، وقال الهيثمي ((المجمع)) (٣٧٧/١٠) أحد إسنادي ((الكبير)) رجاله رجال الصحيح ، وصححه الشيخ الالباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) برقم (٢٣٧٠،٢٤٦٠) .

[٤٥] في رواية : الطبراني ((الكبير)) (١٤٢/١٩) .

[٤٦] أخرجه : الترمذي ((السنن)) (٢٤٨) وصححه الشيخ الألباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٧١٨) ، و ((صحيح سنن االترمذي)) (٢٠١٧) .

[٤٧] قاله الترمذي : في ((السنن)) (٦٥٠/٤) تحت حديث رقم (٢٤٨١) .

[٤٨] أخرجه : ابن ماجة (١٦٠١) ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٣٠١) ، و(الاوراء) : (٧٦٤) .

[٤٩] أنظر : ((ارواء الغليل)) (٧٥٦) ، وهو حديث حسن .

وەخوای گەورە خەڵکان زیندوو دەکاتەوە لەتافی لاویدان و تەمەنیان لە سی و سێ ساڵاندایە وەکو لەفەرمودەکەی میقداد دا هاتووە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:((...ما من احد يموت سقطاً* ولاهرماً وانما الناس فيما بين ذلك الا بعث ابن ثلاث وثلاثين سنة...)) [٥٠]. واتە: (( هەر کەسێك کەدەمرێت لە بار چوو بێت یاخود بە پیری مرد بێت ئەوا خوای گەورە لەتەمەنی سی وسێ ساڵیدا زیندویان دەکاتەوە)) .

وەخوای گەورە موسوڵمانان لەسەر شێوەی باوکە ئادەم زیندویان دەکاتەوە کە درێژیان شەست باڵە : ئەبوهورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((فكل من يدخل الجنة على صورة ادم ستون ذراعاً)) [٥١] واتە: ((هەر کەسێك کە دەچێتە ناو بەهەشت لەسەر شێوەی ئادەمە بەرزیەکەی شەست باڵە)).

ڕیوایەتێکی تردا لەئەبی هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((...وهم على خلق ادم ستون ذراعاً في عرض سبعة أذرع)) [٥٢] . واتە ((کەسانی ناو بەهەشت لەسەر شێوەی ئادەمن بەرزیەکەیان شەست گەزە وەپانیەکەیان حەوت گەزە)).وەخوای گەورە شێوەی موسوڵمانان ئەکاتە باشترین وێنە هەموو ڕەنگ سپین و چاو ڕێژراون .

مەعاز ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((يدخل اهل الجنة جرداً مرداً مكحلين بني ثلاث و ثلاثين )) [٥٣] واتە: ((ئەهلی بەهەشت کاتێ دەچنە ناو بەهەشتەوە بێ موو و چاو ڕێژراون وگەنجی تەمەن سی و سێ ساڵانن)) .

---

* سقطاً : هي الولد يسقط قبل تمامه وهو مستبين الخلق .

[٥٠] أخرجه : الطبراني ((الكبير)) (٢٠/٦٦٣)، وقال الهيثمي ((المجمع)) (١٠/٣٣٤) ، إسناده حسن ، وقال المنذري ((الترغيب)) (٦/٢٧٣) : رواه البيهقي بإسناد حسن ، وقال الشيخ الألباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٢٥١٢) : إسناده صحيح.

[٥١] أخرجه : البخاري (٣٣٢٦) ، ومسلم (٤/٢١٨٣) .

[٥٢] أخرجه : احمد (٢/٢٩٥) ، وقال الهيثمي ((المجمع)) (١٠/٣٩٩) ، رواه الطبراني ((الصغير)) (٨٠٨) و ((الأوسط)) إسناده حسن ، وصححه الشيخ احمد شاكر في تحقيق ((المسند))(١٥/٧٤) وقال :إسناده صحيح.

[٥٣] أخرجه : احمد (٥/٢٣٢) ، والترمذي (٢٥٤٥) وقال حسن غريب ، والهيثمي ((المجمع)) (١٠/٣٩٩) وقال : إسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترمذي)) (٢٠٦٤)، وفي ((المشكاة)) (٥٦٣٩) .

لەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((**یدخل اهل الجنة جرداً مرداً بیضاً جعاداً مكحلين** ))[٥٤] واتە: ((ئەهلی بەهەشت کە دەچنە بەهەشتەوە بێ موو و ڕەنگ سپین و خوای گەورە دەیانخاتە یەك شێوەوەو(**جعاداً**)ن ئەم ووشەیە دوو واتای هەیە : یان قژیان لوول و ئالۆز بووە یان بە واتاکەی تر لاشەیان بەهێز و پتەو دەبێت وەچاویشیان ڕێژراوە)) ، پاشان خوای گەورە ڕق و کینە و ڕەوشتی خراپ و دوژمنایەتی لەدڵی موسوڵمانان دەردەکێشێت پاشان دەیانخاتە ناو بەهەشت وەکو میقداد ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی : ((......**فان كان من اهل الجنة ((أي من المؤمنين)) كان على مسحة ادم ، وصورة يوسف، وقلب أيوب** .......))[٥٥] واتە: ((هەر کەسێك لەئەهلی بەهەشت کە دەچێتە ناو بەهەشت بە شێوەی ئادەمە لەبالا بەرزی دا وەبە شێوەی یوسفە لەجوانیدا وەلەسەر شێوەی پاکێتی دڵی ئەیوبە - سەلامی خوایان لێ بێت -)) وە پێغەمبەر یوسف ﷺ نیوەی جوانی پێ بەخشراوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((**اعطي يوسف ((وامه)) شطر الحسن**))[٥٦] واتە: ((نیوەی جوانی بەخشراوە بەیوسف ودایکی)) لەڕیوایەتێکی تردا : ((**وقد اعطي يوسف شطر الحسن** )) واتە: ((نیوەی جوانی دراوە بە یوسف)).

کەسانی بەهەشت هیچ جیاوازیەك لە نێوانیاندا نیە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((...**لااختلاف بينهم ولا تباغض قلوبهم على قلب رجل واحد** ... ))[٥٧] واتە: ((هیچ جیاوازیەك و ڕق و کینەیەك لەنێوانیان دا نیە و دڵەکانیان لەسەر دڵی یەك پیاوە ...)) وە بە گەیشتنی باوەڕداران بۆ ناو بەهەشت دەست دەکەن بە خواردنەوەی ئاوی ئەو ڕووبارەی کە لای

---

[٥٤] أخرجه : احمد (٢/٢٩٥) رقم (٧٩٣٣) وقال محققه :حديث حسن بطرقه، وصححه احمد شاكر في ((مسند احمد)) (٧٤/١٥) ، والترمذي (٢٦٦٢) ، والدار مي (٢٨٢٩) ، والطبراني ((الصغير)) (١٧/٢) رقم (٨٠٨) ، وقال السيوطى في تخريج ((أحاديث شرح العقائد)) : (١٢) إسناده حسن .

[٥٥] أخرجه : الطبراني (٢٠/٦٣٣٠) ، وقال الهيثمي ((المجمع)) (١٠/٣٣٤) إسناده حسن ، وقال الشيخ الألباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٢٥١٢) إسناده صحيح .

[٥٦] أخرجه : احمد ( ١٤٠٥٠) وقال محققه الارناؤوط : إسناده صحيح على شرط مسلم، وابن شيبة (١٩٦/٤) ، والحاكم (٥٧٠/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي .

[٥٧] في رواية : البخاري (٣٢٤٥) .

دەرگای بەهەشتەوەیە وە هەرچی ئازار و پیسی هەیە بە بۆنەی ئەو ئاوەوە دەڕوات وە خۆشی ونیعمەتەکان بە سەریاندا دەڕژێت وە قژیان نا ئالۆزکێت وبژ نابێت ...

## دەبێت لەبەردەم دەرگای بەهەشتدا چی هەبێت!

لەبەردەم دەرگاکانی بەهەشت دا ڕووبارێك یان چەند ڕووبارێکی لێیە :

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((**الشهداء على بارق* نهر بباب الجنة ، في قبة خضراء ، يخرج اليهم رزقهم من الجنة بكرة وعشياً** )) [٥٨] واتە: ((شەهیدەکان ڕۆحیان دەچێتە ناو گومەزێکی سەوز لای ڕۆخی ڕووبارێکی بەردەم بەهەشت لەبەهەشتەوە هەموو بەیانیان و ئێوارانێك ڕزقیان بۆ دێت)) ، وە هەروەها دەتوانرێت فەرمووەدەکەی مالیکی کوڕی ئەبو سەعسەعەی ئەنصاریش ﷺ بهێنرێتەوە بە بەڵگە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((**...رُفعت لي سدرة المنتهى ، فأذا نبقها مثل قلال هجر ، واذا ورقها مثل اذان الفيلة ، واذا اربعة انهار ، نهران باطنان ، ونهران ظاهران ، فقلت : ما هذا ياجبريل ؟ قال : أما الباطنان فنهران في الجنة ، واما الظاهران فالنيل والفرات**)) [٥٩] . واتە: ((پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : هەر لە دوورەوە چوار ڕووبار دیار بوو دوو ڕووبار لەناو بەهەشت وە دوانی تر لەدەرەوەی بەهەشت ئەو دوانەی ناو بەهەشت [ پێ دەچێت کەوسەر و سەلسەبیل بێت (واللە أعلم). وە ئەو دوانەی دەرەوەی بەهەشت فورات و نیلە ( سەرچاوەکەی کە لەبەردەم بەهەشت دایە خوای گەورە خۆی دەزانێت کە چۆن دەیهێنێت و لەسەر زەویدا هەڵی دەقوڵێنێت ) ] بە جبریلم ووت ئەوانە چین ؟ فەرمووی ئەوانە دوو ڕووباریان لەبەهەشت دایە وەئەوانەی کە لەدەرەوەی بەهەشتن نیل و فوراتن)) وەئەم دوو ڕووبارە پێش ئەوەی باوەڕداران بچنە ناو بەهەشتەوە لێ ی دەخۆنەوە وەکو لەفەرموودەکەی ئیمامی عەلی ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((يساق

---

* بارق نهر : أي طرف وحافة النهر .

[٥٨] أخرجه : احمد (٢٦٦/١) والطبراني ((الكبير)) (١٠٨٥) ، والحاكم (٧٤/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي ، والطبري (٢٣٢٣) ، وقال الحافظ ابن كثير ((تفسيره)) (٦٠٧/١) رواه الطبراني باسناد جيد ، وابن ماجة (٤٦٥٨) وقال محققه : اسناده قوي ، وقال السيوطي ((شرح الصدور)) (ص: ٢٣١) سنده حسن ، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (٣٧٤٢) ، وقال الارناؤوط في تخريجه ((زاد المعاد)) (٩٢/٣) اسناده صحيح .

[٥٩] اخرجه : البخاري (٣٢٠٧) .

الذين اتقوا ربهم الى الجنة زمراً حتى اذا انتهوا الى باب من ابوابها وجدوا عنده شجرة يخرج من تحت ساقها عينان تجريان ...))[٦٠] واتە: ((ئەو کۆمەڵانەی کە تەقوای خوایان کردوە بەرێ دەکرێن بەرەو بەهەشت تاکو دەگەنە بەردەم دەرگای بەهەشت درەختێکی گەورە دەبینن کە دوو ڕووبار لەژێری دا دەڕوات ...)).

## دەرگاکانی بەهەشت و بیناکانی

خوای گەورە دیواری بەهەشتی لەئاڵتون و زیو دروست کردووە وەکو لەم فەرموودەیەدا هاتووە لە ئەبی سەعیدی خدریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((انّ حائط الجنة لبنة* من ذهب ولبنة من فضة ...))[٦١] واتە: ((دیواری بەهەشت لەخشتی ئاڵتون و خشتی زیو دروست کراوە ...)) ، هەروەها ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((... قلنا يا رسول الله ، حدثنا عن الجنة مابناؤها ؟ قال : لبنة من ذهب ، ولبنة من فضة ، وملاطها المسك الاذفر ، وحصباؤها اللؤلؤ والياقوت ، وترابها الزعفران...))[٦٢] واتە: ((ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا دەربارەی بەهەشت پێمان بڵێ لەچی دروست کراوە؟ فەرمووی : خشتێکی ئاڵتونە و خشتێکی زیوە و چەو ولمەکەی هەمووی

---

[٦٠] اخرجه : الطبري (٣٥/٢٤) ، وابن ابي الدنيا ((صفة الجنة)) (٨) موقوفاً ، والبيهقي ((البعث)) (٢٤٦) ، وابن ابي شيبة (٣٣٩٩٣)، وأبو نعيم ((صفة الجنة)) (٢٨١،٢٨٠) ، وابن كثير ((نهاية البداية)) (١٢٦/٢) ، وقال الحافظ ابن حجر العسقلاني ((المطالب العالية)) (٤٥٩٢) هذا حديث صحيح ، وصححه البوصيري ايضاً في ((اتحاف الخيرة المهرة)) ) برقم (١٠٢٠٨) ، وقراه السيوطي ((الدر المنثور)) (٢٦٣/٧)، واخرجه: المنذري ((الترغيب والترهيب)) (٥٤٣٨) ، و ضعفه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) برقم (٢١٨١) ، ولهذا الحديث شاهدان : الاول : اخرجه الحاكم (٣٧٦/٢) وهو حديث صحيح بلفظ ((...فينطلق به الى غدير عند باب الجنة فيغتسل فيعود إليه ريح أهل الجنة و الوانهم)) . واتە: ((بەرێ دەکەوێت بەرەوجۆگەیەکی گەورە لای دەرگای بەهەشت خۆی دەشوات و بۆنی خۆش و ڕوخساری جوانی کەسانی ناو بەهەشتی بۆ دەگەڕێتەوە وبەرامەی بەهەشت و ڕەنگ و بۆکانی دەچێتەوە بەسەردا)) الثاني : اخرجه مسلم (١٧٨) بلفظ:((ثم ترفع له شجرة عند باب الجنة)) واتە: ((...پاشان لای دەرگای بەهەشت درەختێکی لێ دەر دەکەوێت))

* لبنة : طابوقة او مايبنى به الجدار .

[٦١] اخرجه : البزار (٣٥٠٨) موقوفاً على ابي سعيد باسنادٍ صحيح كما قال الحافظ العراقي في تخريج ((الاحياء)) (٥٢٢/٤)، وقال المحقق ابن القيم في ((حادي الارواح)) الباب (١٥٦) والحديث صحيح موقوفاً .

[٦٢] اخرجه : احمد (٣٠٤/٢) ، وابن حبان (٧٣٨٧) وقال محققه حديث صحيح بشواهده ، والترمذي (٢٥٢٦) برقم (٢٠٥) ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (٣١١٦)، وفي ((المشكاة)) (٨٩/٣) .

مرواریە و تێکەڵی نێوانەکەی میسکە وە خۆڵەکەشی زەعفەرانە ...)) . وە دەرگاکانی بەهەشت هەشت دەرگایە وەکو لەم فەرمودەیەدا هاتووە ، لەسەهلی کوڕی سەعدەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((...**في الجنة ثمانية ابواب**)) [٦٣] واتە: ((...لەبەهەشتدا هەشت دەرگای هەیە)) ، وەلە ڕیوایەتەکەی عوتبەی سولەمیدا ﷺ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((**الجنة لها ثمانية أبواب والنار ، لها سبعة أبواب** ...)) [٦٤] واتە: ((بەهەشت هەشت دەرگا هەیە و دۆزەخیش حەوت دەرگای هەیە)) ، وە عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((...**الاّ فتحت له أبواب الجنة الثمانية يدخل من أيها شاء** )) [٦٥] (لەباسێکی دەست نوێژدا بوو ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەوا هەر هەشت دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە تا لەهەر کامیانە ویستی لێ بوو بچێتە ناوی)). وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فراوانی دەرگاکانی بەهەشتی ڕوون کردۆتەوە کە جیاوازی ماوەی نێوانیان . وەکو مەککە و مەدینە و هەجەری بەحرەینی وایە ...

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((...**والذي نفسي بيده انّ مابين المصراعين من مصاريع الجنة كما بين مكة وهجر اوكما بين مكة وبُصرى** )) [٦٦] واتە: ((سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە نێوانی دوو دەرگای بەهەشت بەئەندازەی ماوەی نێوان شاری مەککە و هەجەرە یاخود بەئەندازەی ماوەی نێوان مەککە و بوصرایە)).

وە لەڕیوایەتێکی تردا لەعوتبەی کوڕی غەزوانەوە ﷺ دەفەرموێت: ((... **ولقد ذكر لنا انّ مابين مصراعين من مصاريع الجنة مسيرة أربعين سنة** ..)) [٦٧] . واتە: ((پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کردووین کە ماوەی نێوان دوو دەرگای بەهەشت چل ساڵە ...)). ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**لنا انّ مابين المصراعين من مصاريع الجنة**

---

[٦٣] أخرجه : البخاري (٣٢٥٧) .

[٦٤] اخرجه : احمد (١٨٥/٤) ، وابن سعد (٤٣٠/٧)، وصححه الشيخ الالباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (١٨١٢) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٣١١٩).

[٦٥] اخرجه : مسلم (٢٣٤) ، وابو داود (١٦٩) ، والنسائي ( ٩٢/١) .

[٦٦] أخرجه : البخاري (٤٧١٢) ، ومسلم (٣٢٨) .

[٦٧] اخرجه : احمد (١٧٤/٤) ، ومسلم (١٠٢/١٨) بشرح النووي .

**مسيرة أربعين سنة ..))** [٦٨] واتە: ((ماوەی نێوان دوو لای دەرگایەکی بەهەشت ماوەی چل ساڵ ڕێگەیە)).

وەلەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : **((...ما بين مصراعين من مصاريع الجنة مسيرة سبع سنين))** [٦٩] .واتە: ((ماوەی نێوان دوو لای دەرگایەکی بەهەشت ماوەی حەوت ساڵە)) . وەئەم ڕیوایەتانە دەریدەخات کە دەرگاکانی بەهەشت جیاوازن لەڕووی گەورەیی و فراوانی و پانیەوە هەیانە ماوەی چل ساڵە و هەندێکیان حەوت ساڵە وەهەندێکیان ماوەی نێوانیان نێوانی مەککە و هەجەرە، هەموو دەرگاکانی بەهەشت ناویان هەیە بەپێی کردەوە چاکەکان ، وەکو دەرگای خێرکردن و دەرگای ڕەیان و جیهاد و نوێژ ، وەکو لەفەرموودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ داهاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت :

**((...فمن كان من اهل الصلاة دُعي من باب الصلاة ، ومن كان من اهل الجهاد دُعي من باب الجهاد ...))** [٧٠] .واتە: ((...هەر کەسێك خاوەن نوێژ بێت (واتە شەو نوێژ و ڕەواتب و سوننەتەکانی ئەنجام دابێت) لەدەرگای نوێژکردنەوە بانگی لێ دەکرێت وەهەر کەسێك خاوەنی جیهاد بێت لە دەرگای جیهاد کردنەوە بانگ دەکرێت ...)) .

وە هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە کە کەسێك لەدەرگای زیکر کردنی خوا وە بانگ دەکرێت ، لەسەعدی کوڕی عەبادەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : **((...الا**

---

[٦٨] اخرجه : احمد (٣/٢٩) ، وصححه الشيخ الالباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (١٦٩٨) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٢١٩٠).

[٦٩] اخرجه : ابن حبان (٧٣٨٨) وقال محققه : اسناده صحيح ، وقال الشيخ الالباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٤/٢٧٤) اسناده صحيح .

[٧٠] أخرجه: البخاري (٣٦٦٦) ، ومسلم (١٠٢٧) وفي رواية ابي هريرة: ((اذاكان يوم القيامة دعي الانسان باكثر عمله...)) واتە: ((لەڕۆژی قیامەت دا مرۆڤەکان بەزۆرینەی کردەوەکانیان بانگ دەکرێن ئەگەر نوێژەکانیان باشتر بوو ئەوا بەو ناوەوە بانگیان لێ دەکرێت وە ئەگەر ڕۆژوەکانیان باشتر بێت ئەوا بەو ناوەوە بانگیان لێ دەکرێت وەئەگەر خاوەنی جیهاد بوون ئەوا بەناوی جیهادەوە پاشان دێتە لای دەرگایەك لەدەرگاکانی بەهەشت کە پێی دەوترێت (ڕەیان) ڕۆژوەوانەکانی لێوە بانگ دەکرێن، ئەبو بەکر فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا کەس هەیە لەدەرگای دوو کردەوە وە بانگی لێ بکرێت ؟ فەرمووی : بەڵێ : ئەوە تۆ دەبیت)) رواه البزار (٣٤٧٤) واسناده حسن كما قال الهيثمي ((مجمع الزوائد)) (١٠/٣٩٨) .

ادلك على باب من ابواب الجنة ؟ لاحول ولا قوة الا بالله ...)) [٧١] واته ((ئایا دەرگایەك لەدەرگاکانی بەهەشتت نیشان بدەم ئەویش زیکری ( لاحول ولاقوة الاباللە) یە)) ، وە یەکێك لە دەرگاکانی تری بەهەشت : دەرگای چاکەکردنە لەگەڵ باوك ودایکدا ، ئەبودەرداء ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: ((الوالدُ أوسط أبواب الجنة فأضع ذلك الباب أو إحفظهُ –في رواية– [ في حافظ على والديك أوترك]))[٧٢]. واتە: باوك دەرگای ناوەڕاستی دەرگاکانی بەهەشتە تۆش ئەو دەرگایە باش ئاگاداری بکە یان لێ گەڕێ — لە ڕیوایەتێکدا: پارێزگاری لەباوك و دایکت بکە یان وازبهێنە.

## یەکەم کەس کە دەچێتە ناو بەهەشت

یەکەم کەس کە دەچێتە ناو بەهەشتەوە پێش هەموو دروستکراوانی خوا پێغەمبەری ئازیز و سەروەرمانە ﷺ ، ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((...انا اول من یقرع باب الجنة)) [٧٣] واتە: ((...من یەکەم کەسم کەتەقە دەدەم لەدەرگای بەهەشت)) . وە خوای گەورە فەرمانی کردەوە کە یەکەم جار دەرگای بەهەشت بۆ پێغەمبەر ﷺ بکرێتەوە ، ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((... فیقول : بك امرت ان لاافتح لاحد قبلك)) [٧٤] .واتە: ((فریشتەی دەرگاوانی بەهەشت بەپێغەمبەر ﷺ دەڵێت : فەرمانم پێ کراوە کە بۆ هیچ کەسی تری نەکەمەوە لەپێش تۆدا)) .وەیەکەم ئومەت کە دەچنە ناو بەهەشتەوە ، ئومەتی ئیسلامیەکە باشترین ئومەتن وەئومەتی باشترین پێغەمبەرن . ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((نحن اول من یدخل الجنة))[٧٥] واتە: ((ئێمە یەکەم ئومەتین کەدەچینە ناو بەهەشتەوە)) . وەیەکەم کۆمەڵ کە دەچنە ناو

---

[٧١] اخرجه : احمد ( ٤٢٢/٤) ، والترمذي (٣٨٣٤) قال : صحيح غريب ، والحاكم (٢٩٠/٤) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي ، وصححه الشيخ الالباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (١٧٤٦) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٢٦١٠) ، وفي ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٨٣٤) .

[٧٢] أخرجه:ابن ماجة (٣٦٦٣،٢٠٨٩)، وصححه الشيخ الألباني ((الصحيحة))(٩١٣)،و((صحيح ابن ماجة)) (١٦٩٩،٢٩٥٥).

[٧٣] اخرجهُ : مسلم (٣٣١) .

[٧٤] اخرجهُ : مسلم (٣٣٣) .

[٧٥] اخرجه : مسلم (٥٨٥/٢) .

بەهەشتەوە لەئومەتی پێغەمبەر ﷺ ، ئەو حەفتا هەزار کەسەن کە خوای گەورە پەیمانی دابوو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ.

جابر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((... **فتنجو اول زمرة وجوههم كالقمر ليلة البدر سبعون الفاً لايحاسبون ثم الذين يلونهم ...** ))[٧٦] واتە: ((.... یەکەم کۆمەڵ کە ڕزگاریان دەبێت ودەچنە بەهەشتەوە ، ڕوویان درەوشاوەیە وەك مانگە شەوی چواردە ئەو حەفتا هەزار کەسەن کە لێپرسینەوەیان لەسەر نی یە پاشان ئەوانی تر بەدوایاندا دێن...)).

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ باسی چۆنێتی چونە ناو بەهەشتی ئەوانەی کردوە کە هەندێکیان دەستی هەندێکیان گرتووە ، وە ڕووشیان لەسەر شێوەی مانگە شەوی چواردەیەمی درەوشاوەیە . ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**أول زمرةِ تدخل الجنة من أمتي [ سبعون ألفاً بغير حساب ]** [٧٧] **[ ولاعذابٍ ]** [٧٨] **متما سكون آخذلإ بعضهم ببعض حتى يدخل أولهم و آخرهم الجنة...**))[٧٩] واتە: ((یەکەم کۆمەڵ لە ئومەتەکەی من کە دەچنەناو بەهەشت [حەفتا هەزار کەسن بەبێ لێپرسینەوە] [وەبەبێ سزا] هەندێکیان دەستی هەندێکیان گرتووە بەیەکەوە تاوەکو هەر حەفتا هەزارەکە هەموویان دەچنە ناو بەهەشت ...)).وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت :((...**لااختلاف بينهم ولاتباغض ، قلوبهم على قلب رجل واحد**))[٨٠].واتە: ((...هیچ جیاوازی و ڕق وکینە و بوغز لە نێوانیاندا نی یە دڵەکانیان وەك دڵی یەك پیاوە)) .وە لە ڕیوایەتەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((...**تضئ وجوههم اضاءة القمر ليلة البدر ...**))[٨١] . واتە: ڕوویان دەدرەوشێتەوە وەکو درەوشاندنەوەی مانگی شەوی چواردە ...)).

---

[٧٦] اخرجه : مسلم (٣١٦).

[٧٧] أخرجه: البخاري (٣٣٤٧) ، و (٦٥٤٣) ،و مسلم (٢١٩٩ ) من حديث سهيل بن سعد.

[٧٨] في رواية مسلم.

[٧٩] اخرجه : الحميدي (١١٤٣) ، واحمد (٧١٥٥،٧١٦٨، ٨٢٠٥)، والبخاري (٣٣٢٧) ، ومسلم (٢٨٣٤) ، وابن ماجة (٤٣٣٣)، وابن حبان (٧٤٢٠) ،وعبد الرزاق (٢٠٨٦٦).

[٨٠] في رواية : البخاري (٣٢٤٥) .

[٨١] في رواية : البخاري (٥٨١١) ، ومسلم (٢٦٩).

وەعمرانی کوڕی حصین ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**قيل : ومن هم ؟ قال ( النبي) ﷺ هم : الذين لايكتون* ، ولايسترقون* ، ولايتطيرون* ، وعلى ربهم يتوكلون ...**))[٨٢] واتە: ((ووترا: کێن ئەوانە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەوانەن کەداخ ناکەن و داوا لەبرا موسوڵمانەکانیان ناکەن کە دوعایان بەسەردا بخوێننەوە وەهیچ شتێك بە شووم نازانن وە هەر پشت وپەنایان بەخوای خۆیانە)) .

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردۆتەوە کە هەژارە کۆچکارەکان لەپێشرەوی ئەو کۆمەڵەن کە دەچنە بەهەشت ، لەعەبدوڵای کوڕی عەمرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((...**أول من يدخل الجنة من خلق الله ، الفقراء المهاجرون الذين يسدبهم الثغور ، وتتقى بهم المكاره* ، ويموت احدهم وحاجته في صدره ، لايستطيع لها قضاء ، فيقول الله لمن يشاء من ملائكته : ايتوهم فحيّوهم ، فيقول الملائكة : ربنا نحن سكان سماواتك وخيرتك من خلقك أفتأمرنا ان ناتي هؤلاء ، فنسلم عليهم ؟ قال ( الله تعالى) : انهم كانوا عباداً يعبدوني لايشركون بي شيئاً ، وتسد بهم الثغور ، وتتقى بهم المكاره ، ويموت أحدهم وحاجته في صدره لايستطيع لها قضاء ، فتأتيهم الملائكة عند ذلك ، فيدخلون عليهم من كل باب : ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ۝٢٤ ﴾** (الرعد: ٢٤) ))[٨٣] واتە: ((...یەکەم دروستکراوانێکی خوا کە دەچنە ناو بەهەشتەوە هەژارە کۆچکارەکانن کە هەموو کەلێنێکیان پێ پڕدەکرایەوە وە هەموو نارەحەتیەکیان پێ دوور دەخرایەوە ، ئەوانە بە ناواتی خۆیانەوە سەریان دەنایەوە و نەیان دەتوانی بەدی بهێنن ، خوای گەورە بەو فریشتانەی

---

* يكتون : لايستعملون الكيل.

* لايسترقون : لايطلبون من احد ان يقرأ عليهم الرقية .

* لايتطيرون : لايتشاءمون .

[٨٢] في رواية : البخاري (٤/١٤٠٦) ، ومسلم (٣٧١) .

* وتتقى بهم المكاره : كانوا فداء للاسلام واهلها .

[٨٣] اخرجه : احمد (٢/١٦٨) ، والاصفهاني ((حلية الاولياء)) (١/٣٤٧) ، والبزار (٣٦٦٥) ، والحاكم (٢/٧١) وصححه وافقه الذهبي ، والبيهقي ((شعب الايمان)) (١٠٣٨) ، وقال الهيثمي ((المجمع)) (١٠/٢٥٩) ، رواه احمد والبزار والطبراني ورجالهم ثقات ، وابن حبان (٧٤٢١) وقال محققه : اسناده صحيح ، وصححه الشيخ احمد شاكر في تحقيق ((المسند)) (٦٥٧٠) (١٠/٧٦) ،وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٣١٨٣).

خۆی دەفەرموێت : بڕۆن پێشوازیان لێ بکەن ، فریشتەکان دەڵێن : ئەی خودایە ئێمە نیشتەجێی ئاسمانەکانی تۆین وە چاکترین دروست کراوانی تۆین فەرمانمان پێ دەکەیت کە بچینە لای ئەوانە و سەلامیان لێ بکەین ؟ خوای گەورە دەفەرموێت : ئەوانە بەندەی من بوون دەیان پەرستم و هیچ هاوتایان بۆ بڕیار نەدەدام وە هەموو کەلێنێکیان پێ پڕدەکرایەوە و هەموو ناڕەحەتیەکی ڕۆژگاریان پێ دوور خرایەوە ، یەك لە وانە دەمرد و هیواکانی لە ناوسنگیدا بوو نەیدەتوانی بیهێنێتە دی ، فریشتەکانیش لە هەموو دەرگاکانەوە پێشوازیان لێ دەکەن و دەڵێن: سەلامتان لێ بێت بە هۆی ئارام گریتانەوە گەیشتنە چاکترین دوا هەوارگەتان)) .وە لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((...اول ثلة يدخلون الجنة الفقراء المهاجرين : الذين تتقى بهم المكاره ، اذا امروا سمعوا وأطاعوا ، وان كانت للرجل منهم حاجة الى السلطان لم تقض له حتى يموت وهي في صدره ، وانّ الله عزوجل ليدعوا يوم القيامة الجنة فتأتي بزخرفها وزينتها فيقول : اين عبادي الذين قاتلوا في سبيلي وقوتلوا و اوذوا في سبيلي و جاهدوا في سبيلي ادخوا الجنة ، فيدخلونها بغير حساب [عذاب]، و تأتي الملائكة فيسجدون فيقولون : ربنا نحن نسبح بحمدك الليل والنهار و نقدس لك ، من هؤلاء الذين آثرتهم علينا ؟ فيقول الرب عزوجل : هؤلاء الذين قاتلوا في سبيلي ، و اوذوا في سبيلي ، فتدخل عليهم الملائكة من كل باب ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ۝٢٤﴾))[84] واتە: ((یەکەم کۆمەڵ کە دەچنە بەهەشتەوە هەژارە کۆچکارەکانن ئەوانەن کە ناڕەحەتیەکانی ڕۆژگاریان پێ دوور خرایەوە ئەگەر فەرمانیان پێ بکرایە گوێڕایەڵیان دەکرد ،و ئەگەر یەکێکیان پێویستیەکی بەکار بەدەستێك هەبووایە ئەوا ئەو پێویستیەی بۆ نەدەهاتە دی و بەو ئاواتەوە سەری دەنایەوە ، وە لەو ڕۆژەدا خوای گەورە بانگی بەهەشت دەکات و ئەویش بە خۆڕازاندنەوە و جوانی یەکانیەوە دێت و خوای گەورە دەفەرموێت : لەکوێن ؟ بەندەکانی من ئەوانەی لەپێناوی مندا بەشەڕ هاتوون و شەڕیان لەگەڵ کراوە وئازاردراون وکوژراون با بچنە ناو بەهەشتەوە ، و ئەوانیش دەچنە ناو بەهەشتەوە بە بێ لێپرسینەوە ، وفریشتەکان دێن و سوجدە

---

[84] اخرجه:أحمد (٦٥٧١) وقال محققه : حديث صحيح ، و الحاكم (٢/٧١) وصححه ووافقه الذهبي، و الاصفهاني في ((الترغيب والترهيب)) (ص: ٢١٣) ، والبيهقي ((شعب الايمان)) (٤٢٥٩) ، وصححه الشيخ الالباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٢٥٥٩) .

بۆ خوای خۆیان دەبەن و دەڵێن : ئەی پەروەردگارمان ئێمە شەو و ڕۆژ تەسبیحات و سوپاسی تۆ دەکەین و بە گەورت دەزانین ، ئەمانە کێن کە پێش ئێمەت خستوون؟ خوای پەروەردگار دەفەرموێت : ئەوانە ئەو کەسانەن کەلە پێناوی مندا بەشەڕ هاتوون و شەڕیان لەگەڵ کراوە و ئازاردراون فریشتەکانیش لە هەموو دەرگاکانەوەپێشوازیان لیٚ دەکەن و دەچنە لایان وپێیان دەڵێن : ((سلام عليكم بما صبرتم)) واتە: ((سڵاوتان لیٚ بێت بۆئارام گرتن و خۆڕاگریتان)).

وە یەکەم کەس لە هەژارە کۆچکارەکان کە دەچێتە ناو بەهەشتەوە ئەبوبەکری صدیقە ﷺ پێغەمبەر ﷺ بە ئەبوبەکری فەرموو :

((...اما انّك يا ابا بكر اول من يدخل الجنة من امتي...))[85] .واتە: ((... تۆ ئەی ئەبو بەکر یەکەم کەس دەبێت لە ئومەتەکەم کە دەچێتە ناو بەهەشتەوە ...))، وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردۆتەوە کە هەژارە کۆچکارەکان پێش دەوڵەمەندەکانیان بە چل ساڵ یان پێج سەد ساڵ دەچنە ناو بەهەشتەوە (والله اعلم) .

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((...بشر فقراء المهاجرين انهم ليدخلون الجنة قبل الاغنياء ((يوم القيامة)) بأربعين خريفاً ...))[86] واتە: ((... مژدە بدە بە هەژارە کۆچکارەکان کە ئەوان بە چل ساڵ پێش دەوڵەمەندەکان ((لەڕۆژی قیامەت دا)) دەچنە ناو بەهەشتەوە...)) پیٚ دەچێت پێش سەرجەم موسوڵمانانی بەهەشت بە چل ساڵ بچنە ناو بەهەشتەوە .وە لە دوای هەژارە کۆچکارەکان ئەنصاریەکان دەچنە ناو بەهەشتەوە ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((...الانصار ...اول من يدخل الجنة من أمتى))[87] واتە: ((ئەنصاریەکان یەکەم کەسانێکن لە ئومەتەکەم کە دەچنە ناو بەهەشت)). وە لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : ((ان فقراء المهاجرين يدخلون الجنة قبل أغنيائهم بمقدار

---

[85] اخرجه : ابو داود (٤٦٥٢) ، والحاكم (٧٣/٢) و صححه على شرطهما ووافقه الذهبي ، والامام احمد في ((الفضائل)) (٥٩٣) وقال محققه : اسناده صحيح لغيره ، وضعّفه الشيخ الالباني في ((سلسلة الأحاديث الضعيفة)) (١٧٤٥) .

[86] أخرجه: مسلم (٧٣٨٨) ، الدارمي (٣٣٩/٢) ، وابن حبان (٦٧٧) و اللفظ له وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم ، و الحاكم (٧٠/٢) وصححه ووافقه الذهبي ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (٩٦).

[87] أخرجه: البزار باسناد حسن — كما قال الهيثمي في ((المجمع)) (٤١/١٠).

خمسمائة عام))[٨٨] واتە: ((هەژارە کۆچکارەکان پێش دەوڵەمەندەکانیان بە ماوەی پێنج سەد ساڵ دەچنە ناو بەهەشتەوە)) .

وەئەم هەژارانە فریشتەکان پێشوازیان لێ دەکەن کاتێ کە دەچنە ناو بەهەشتەوە وە دەورەیان ئەدەن وە خوای گەورە لەزیادەی جگەری حوت خواردنیان دەداتێ وە لەڕووباری سەلسەبیل ئاویان پێ نۆش دەکات ، وەکو لەفەرموودەکەی سەوباندا ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((...قال ((اليهودي)) فمن اول الناس إجازة)) واتە: ((...جولەکەیەك پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی : یەکەم کۆمەڵ ڕێیان پێ دەدرێت بۆ چوونە ناو بەهەشت کێن ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ((فقراء المهاجرين ، قال اليهودي : فماتحفتهم حين يدخلون الجنة ؟ قال : زيادة كبد النون ، قال : فما غذاؤهم على اثرها ؟ قال : ينحر لهم ثور الجنة الذي كان يأكل من أطرافها))[٨٩] واتە: ((هەژارە کۆچکارەکانن ، پاشان ووتی : خواردنی چیان دەدرێتێ؟ فەرمووی : زیادەی جگەری حوت ، پاشان ووتی : کام خواردنیان لە دوای ئەوە پێ دەدرێت؟ فەرمووی : گایەکەی بەهەشتیان بۆ سەر دەبڕرێت کە لەجێگەکانی بەهەشتا دەلەوەڕا ...)) .لەڕیوایەتێکی ئەبی سەعیدی خدری دا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ثور ونون يأكل من زيادة كبدهما سبعون الفاً ...))[٩٠] واتە: یەکەم خواردنیان زیادەی جگەری گا و نەهەنگە کە حەفتا هەزار لێی دەخوات)) ، وەلەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : ((أول شئ يأكله أهل الجنة رأس ثور وكبد حوت...))[٩١] واتە: یەکەم شتێك کەئەهلی بەهەشت دەیخۆن سەرو کەللەی گایەکە لەگەڵ جگەری حوتێك)) .

وەلەڕیوایەتەکەی سەوبانەوە ﷺ دەفەرموێت : ((......قال :فما شرابهم عليه ؟)) واتە: ((پرسیار کرا خواردنەوەیان لە دوای ئەوە چی یە ؟ پێغەمبەر ﷺفەرمووی : (من عين تسمى سلسيلا )...))[٩٢]واتە: ((لە کانیاوێکی بەهەشت کە پێی دەوترێت سەلسەبیل)).

---

[٨٨] اخرجه : ابن ماجة (٤١٢٣)، وحسنه الشيخ الالباني في ((المشكاة)) (٢١٩٨) .

[٨٩] اخرجه : مسلم (٣١٥) ، والحاكم (٤٨١/٣).

[٩٠] اخرجه : البخاري (٦٥٢٠).

[٩١] اخرجه :ابن حبان (٧٤٢٣) : وقال محققه :اسناده صحيح على شرط مسلم .

[٩٢] اخرجه :ابن حبان (٧٤٢٢) وقال محققه : حديث صحيح .

پاشان هاوەڵە بەڕێزەکان جێگەی خۆیان دەگرن لە بەهەشت دا خۆیان و خێزانەکانیان و کوڕەکانیان و نەوەکانیان پێش هەموو موسوڵمانانی تر بەگشتی ، وەکو لەفەرموودەکەی ڕوفاعەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((...ولقد وعدني ربي ان يدخل من أمتي سبعين ألفاً بغير حساب واني لآرجوا ان لايدخلوها ، حتى تتبؤوا أنتم ومن صلح من أزواجكم ((وذرياتكم)) مساكن في الجنة))[٩٣] .واتە: ((...خوای گەورە پەیمانی پێداوم کەحەفتا هەزار کەس لەئومەتەکەم بەبێ لێپرسینەوە بچنە ناو بەهەشتەوە هیوادارم ئەوان نەچنە ناوی تاکوخۆتان و ژنەکانتان و کوڕەکانتان و منداڵەکانتان شوێنی خۆتان وەردەگرن لە بەهەشت دا .)).وەیەکەم کەس لەهاوەڵەبەڕێزەکان کەدەچنە ناو بەهەشتەوە ، کۆچکارە بەڕێزەکانن وەکو لەفەرمودەکەی عەبدولای کوڕی عەمرودا ﷺ هاتووە کە دەفەموێت پێغەمبەر ﷺ پێی ووتم: ((اتعلم اول زمرة تدخل الجنة من أمتي؟)) واتە: ((ئایا دەزانیت یەکەم کۆمەڵ لەئومەتەکەم کێن کەدەچنە بەهەشت ؟)) ."قلت : الله ورسوله أعلم " ووتم: خواو پێغەمبەری خوا باشتر دەزانن ، فەرمووی : (( المهاجرون ياتون يوم القيامة الى باب الجنة ، ويستفتحون ، فيقول لهم الخزنة أوقدحوسبتم ؟ فيقولون : بأي شئ نحاسب ؟ وانما كانت أسيافنا على عواتقنا في سبيل الله حتى متنا على ذلك ؟ قال فيفتح لهم ، فيقيلون فيه أربعون عاماً قبل ان يدخلها الناس ))[٩٤] . واتە: ((کۆچکارەکان لە ڕۆژی قیامەت دا دێنە بەردەم دەرگای بەهەشت وە دەرگایان بۆ دەکرێتەوە و دەرگاوانی بەهەشت پێ یان دەڵێت : ئایا خوای گەورە لێپرسینەوەی لەگەڵدا کردن ؟ ئەوانیش دەڵێن لەکام شت لێمان بپرسێتەوە ، ئێمە شمشێرەکانمان بەردەوام

---

[٩٣] اخرجه : احمد (١٦/٤) ، وابن ماجة (٤٢٨٥) ، والطياليسي (١٢٩١) ، والبزار (٣٥٤٣) ، والطبراني ((الكبير)) (٤٥٥٨)، وقال الهيثمي ((المجمع)) (٤٠٨/١٠): رواه البزار و رجاله رجال الصحيح ، والنسائي ((عمل اليوم والليلة)) (٤٧٥)، وقال الحافظ في ((الاصابة))(٤٩٣/٢) اسناده صحيح ، وابن حبان (٢١٢) : وقال محققه :اسناده صحيح على شرط البخاري ، وقال الضياء : رواه احمد واسناده على شرط مسلم كما في ((تفسير القران العظيم)) لابن كثير (٥٥٩/١) ، وصححه العلامة الشيخ الألباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٢٤٠٥) ، وفي ((الارواء)) (١٩٨/٢) وفي ((صحيح ابن ماجة)) (٣٤٥٨) ، وقال الشيخ مقبل في كتابه ((الصحيح المسند)) (٣٤٢/١) :اخرجه احمد وهو حديث صحيح .

[٩٤] اخرجه :الحاكم (٧٠/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، والبيهقي ((شعب الايمان)) (٤٢٦٠) ، وصححه الشيخ الألباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٨٥٣) وقال : صحيح على شرط مسلم .

بەسەر شانمانەوە بوو لەپێناوی خوادا تاکولەسەر ئەوە مردین ؟ دەفەرموێت: دەرگای بەهەشتیان بۆدەکرێتەوە ، پێش ئەوەی خەڵکان بچنە ناوی بەچل ساڵ و ئەوان تیایدا دەحەوێنەوە)).

# هەژارەکان لەپێش دەوڵەمەندەکاندا دەچنە ناو بەهەشت

دوای ئەوەی کەحەفتا هەزاری یەکەم دەچنە ناو بەهەشتەوە ،وە لە دەستەی ئەوانە هەژارە کۆچکارەکانن کە دەچنە ناو بەهەشتەوە پاشان ئەو کەسانە بانگ دەکرێن بۆ بەهەشت کە بەنهێنی و بەئاشکرا سوپاس گوزاری خوایان کردوە لەخۆشی و ناخۆشی دا وەکو ئیبن عەباس ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە: ((**أول من يُدعى الى الجنة يوم القيامة الحمادون الذين يحمدون الله في السراء والضراء**))[٩٥] . واتە: ((یەکەم کەسانێك کەبانگ دەکرێن بۆ بەهەشت سوپاس گوزرانی خوان کەسوپاسی خوایان کردووە لەکاتی خۆشی وناخۆشی دا.)) .پاشان موسوڵمانە هەژارەکان بانگ دەکرێن وەرێگەیان دەدرێت کە بچنە ناو بەهەشتەوە ، پێش برا دەوڵەمەندو کاربەدەستەکانیانەوە ،وەکو لەم فەرموودەیەی عەبدولای کوڕی عەمرو ﷺ داهاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((**تجتمعون يوم القيامة ، فيقال : اين فقراء هذه الامة ومساكينها ؟ قال فيقومون ، فيقال لهم : ماذا عملتم ؟ فيقولون : ربنا ابتلينا فصبرنا ، واتيت الاموال والسلطان غيرنا، فيقول الله :صدقتم ، قال: فيدخلون الجنة قبل الناس**))[٩٦].

واتە: ((هەموو کۆ دەبنەوە لەقیامەتدا و دەوترێت : کوا هەژارەکانی ئەم ئومەتە ؟ دەفەرموێت: دێن وپێ یان دەوترێت چیتان کرد؟ ئەوانیش دەڵێن : ئەی پەروەردگار تاقی کراینەوە و نارامان گرت ، سەروەت وسامان وخێر و دەستەلاتت بەخشی بەغەیری ئێمە ، خوای گەورەش دەفەرموێت : ڕاستتان کرد : دەفەرموێت : ئەنجا دەچنە ناو بەهەشتەوە پێش هەموو

---

[٩٥] اخرجه :الطبراني ((الكبير)) (١٢٣٤٥) وفي ((الدعاء)) (١٧٦٨) ، والبزار (١/١٩٥)، والبغوي ((شرح السنة)) (١٢٧٠) ، والحاكم (١/٥٠٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي وابونعيم الاصفهاني ((الحلية)) (٥/٦٩) ، والهيثمي ((المجمع)) (١٠/٩٥) وقال : رواه البزار باسناد حسن ، وحسنه المنذري ((الترغيب)) (٢٣٢٤)، وضعف الشيخ الألباني رواية الحاكم والطبراني مرفوعاً في ((ضعيف الجامع)) برقم : (٢١٤٧)، و ((ضعيف الترغيب)) (٩٥٦) ، وقال في ((السلسلة الضعيفة)) (٢/٩٤) : رواه ابن المبارك ((الزهد)) (١٩٥) بسند صحيح عن سعيد بن جبير موقوفاً عليه.

[٩٦] اخرجه : ابن حبان (٧٤١٩) وقال محققه :اسناده حسن .

خەڵکان)). وەهەروەها پێغەمبەری خواﷺ ڕوونی کردۆتەوە ،کە هەژارانی ئەم ئومەتە دەچنە ناو بەهەشتەوە پێش دەوڵەمەندەکان بە پێنج سەدساڵ . وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((**يدخل فقراء المؤمنين ((المسلمين)) الجنة قبل اغنيائهم بنصف يوم ، وهو خمسمائة عام**))[٩٧] واتە: ((هەژارە باوەڕدارەکان و((موسوڵمانەکان)) دەچنە بەهەشتەوە پێش دەوڵەمەندەکان بەنیو ڕۆژ کە پێنج سەدساڵە)). وەئەم هەژارو کەم دەستانە زۆرینەی ئەهلی بەهەشتن ، وەکو لە فەرموودەکەی ئوسامە داهاتووە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((**قمت على باب الجنة ((فرأيت اكثر أهلها الفقراء)) ((ورأيت أصحاب الجد محبوسين)) غير ان أصحاب النّار قد أمربهم الى النّار ...**))[٩٨]. واتە: ((وەستام لای دەرگای بەهەشت و ((بینیم زۆربەی کەسەکانی ناو بەهەشت هەژار و کەم دەستەکان بوون)) ((وەبینیم دەوڵەمەندەکانیش لەبەردەم دەرگای بەهەشت دا وەستێنرا بوون)) بەڵام دۆزەخیەکان فەرمانیان پێ کرابوو بۆ ناو ئاگر ...)) .بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە خوای پەروەردگار دەکرد کە لە ڕیزی کۆمەڵ و تاقمی هەژارەکاندا کۆی بکاتەوە، وەلە ودوعاکەی دا دەیفەرموو : وەکو ئەبو سەعیدی خدری ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت : ((**اللهم احيني مسكيناً ، وأمتني مسكيناً واحشرني في زمرة المساكين** ))[٩٩] واتە: ئەی پەروەردگارم بەهەژاری بمژێنە و بەهەژاری بمرێنە و لەگەڵ ڕیز و کۆمەڵی هەژاراندا کۆم بکەرەوە)). وەهەروەها پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ ئومەتەکەی کردووە کە لەماڵی دونیا کەمیان پێ ببەخشێت تاکو لەو کەسانە بن کە پێش دەکەون بۆ چوونە ناو بەهەشت وەکو لەفەرموودەکەی فەزاڵەی کوڕی عوبێدا ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((**اللهم من امن بك ، وشهد اني رسولك ، فحبب اليه لقاءك ، وسهل عليه قضاءك ، وأقلل له من الدنيا ، ومن لم يؤمن بك ولم يشهد أني رسولك ، فلا**

---

[٩٧] اخرجه :احمد (٥/٥٠) ، والترمذي (٢٣٥٣) وقال حسن صحيح ، وابن ماجة (٤١٢٢) ، وابن حبان (٦٧٦) وقال محققه : اسناده حسن ، وقال ابن كثير ((نهاية البداية)) (٢/٣٩٨): اسناده على شرط مسلم ،وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩١٨).وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٣٢٦)، وفي ((المشكاة)) (٥٢٤٣)، وفي ((صحيح الجامع)) (٨٠٧٦) :صحيح .

[٩٨] اخرجه : احمد (٥/٢٠٥ ) ، والبخاري (٥١٩٦) ، ومسلم (٢٧٣٦).

[٩٩] اخرجه : ابن ماجة (٤١٢٦) ، وعبد بن حميد (٢/١١٠) ، وصححه الشيخ الالباني في :((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٣٢٨)، وفي ((الارواء)) (٨٦١) ، وفي ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٣٠٨) .

**تحبب اليه لقاءك ولاتسهل عليه قضاءك ، وأكثر له من الدنيا ))**[١٠٠] واتە : ((ئەی پەروەردگارم هەر کەسێك باوەڕی بە تۆ هێناوە وە شایەتی داوە کەمن نێراوی تۆم بەیەك گەیشتنەوەی خۆتی لا خۆشەویست بکەیت وە قەزا و قەدەری لەسەر سوك بکەیت وە ماڵی دونیای کەم پێ ببەخشیت ، وە هەر کەسێك باوەڕی بەتۆ نی یە و باوەڕی بە ڕەوانە کردنی من نی یە لەلایەن تۆوە خوای گەورە بەیەك گەیشتنی خۆتی لاخۆشەویست نەکەیت و قەزا و قەدەری خۆتی لەسەر سوك نەکەیت و ماڵی دونیای زۆری پێ بدەیت)).

وە لە دەستەی ئەو کەسانەی خوای گەورە دەیانخاتە ناو بەهەشتەوە لەدوای جنۆکە و مرۆڤ ڕۆژەکانە بە تایبەتی ڕۆژی جومعە وە لەگەڵ ڕۆژی ((جومعە)) دا تەنها بانگ بێژان لەئومەتی پێغەمبەر ﷺ دەچنە ناو بەهەشت ، وەکو لە فەرموودەکەی ئەبی موسادا هاتووە رضي الله عنه کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((**ان الله يبعث الايام يوم القيامة على هيئتها ، ويبعث يوم الجمعة زهراء منيرة* ، أهلها يحفون بها* كالعروس تهدي الى كريمها تضئ لهم ، يمشون في ضوئها ، ألوانهم كالثلج بياضاً ، ريحهم تسطع* كالمسك ، يخوصون في جبال الكافور ، ينظر اليهم الثقلان ، مايطرقون تعجباً ، حتى يدخلوا الجنة ، لايخالطهم أحد ، الا المؤذنون المحتسبون**))[١٠١] واتە: ((خوای پەروەردگار ڕۆژەکان وەکو شێوەی خۆیان زیندو دەکاتەوە لەڕۆژی قیامەت دا، وە لە ناو ئەو ڕۆژانەدا ڕۆژی جومعە زیندو دەکاتەوە سپی و پرشنگدارە خاوەنەکانی دەورەی دەدەن ولێ ی کۆ دەبنەوە وەکو بوکێك بەڕی دەکرێت و دەچن بەرەو بەهەشت لەژێر ڕۆشنایی یەکەی ڕۆژی جومعەدا دەڕۆن ڕەنگیان وەکو بەفری سپی وایەو بۆنیان وەکو بۆنی میسك بڵاودەبێتەوە ولەشاخەکانی کافور بەڕێ دەکەون و هەموو جنۆکە و مرۆڤ

---

[١٠٠] اخرجه : الطبراني ((الكبير)) (٨٠٨/١٨) ، وقال الهيثمي ((مجمع الزوائد)) (٢٨٦/١٠) : رجالة ثقات ، وابن حبان (٢٠٨) وقال محققه : اسناده صحيح ، والبيهقي ((شعب الايمان)) برقم (١٠٤٤٥)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (١٣٣٨).

* زهراء منيرة : بيضاء ووضاء .

* يحفون بها : يجتمعون حولها .

* تسطع : تنتشر ريحهم .

[١٠١] اخرجه : ابن خزيمة ((الصحيح)) (١٨٢/١) ، والحاكم (٢٧٧/١) وصححه، و البيهقي ((الشعب)) (٣٠٤١)، وصححه الشيخ الالباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٧٠٦) ،وفي ((صحيح الجامع)) (١٨٧٢) .

سەیریان دەکەن ، چاویان داناخەن تاکو ئەوان دەچنە ناو بەهەشتەوە کەس تێکەڵیان نابێت تەنها ئەو بانگ وێژانەی کە لەبەر خوا بانگیان داوە)). وەپاش تێڕوانین لەفەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێت : ((...ینظر الیهم الثقلان مایطرقون )) . واتە: : ((خەڵکان تەنها سەیری بانگ بێژەکان دەکەن وچاویان لێ ناتروکێنن کاتێ کە دەچنە بەهەشتەوە لەگەڵ ڕۆژی جومعەدا)) ، لەم فەرموودەیەوە ئەو گفتەی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ ڕوون دەبێتەوە کەدەفەرموێت: ((...أطول الناس أعناقاً یوم القیامة المؤذنون ))[١٠٢] . واتە: ((بانگ بێژەکان لە هەموو کەسانێك سەربەرز و گەردن بەرزترن لەڕۆژی قیامەتدا)).

پاشان ئەو موسوڵمانانەی تر کەماون لەئومەتی پێغەمبەر ﷺ دەچنە ناو بەهەشت کە ئەمان پێش هەموو ئومەتەکانی تر دەکەون چونکە باشترین ئومەتن ، وە خوای گەورە تایبەت مەندی کردوون بە ڕێزی زیاتر ، چونکە پێغەمبەرەکەیان باشترین پێغەمبەرە وئومەتەکەشی ، زۆرینەی کەسانی ناوبەهشتن وەکو لەفەرمودەکەی بورەیدەدا ﷺ هاتووە کەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((أهل الجنة عشرون ومائة صف ، ثمانون منها من هذه الامة ، وأربعون من سائر الامم))[١٠٣]. واتە: ((ئەهلی بەهەشت سەدو بیست ڕیزن هەشتایان لەم ئومەتەن وە چل ڕیزەکەی تر لەئومەتەکانی تری پێشوون)).

## چۆن بڕواداران دەچنە ناو بەهەشت ؟

باوەڕداران کۆمەڵ کۆمەڵ بەڕێزەوە ڕەوانەی ناو بەهەشت دەکرێن ، لەسەر ڕوویان خۆشی و کامەرانی دەبینرێت ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾(الزمر: ٧٣) ٠وە موسوڵمانان لەسەر درەوشاوەترین ئەستێرەی ئاسمان دەکرێنە ناو بەهەشت . وەکو لەفەرموودەکەی ئەبو هورەیرەدا

---

[١٠٢] اخرجه : مسلم (٣٨٧) ، ونظر: ((صحیح سنن ابن ماجة)) (٥٩٣)

[١٠٣] اخرجه : احمد (٣٦٦٦١) ، وابو یعلی (٢/٢٩٤) ، والبخاري (٦٥٢٨) ، ومسلم (٣٧٦) ، والترمذي (٢٥٤٦) ، وقال حديث حسن ، وابن ماجة (٤٢٨٣)، وصححه الشيخ الالباني في ((صحیح ابن ماجة)) (٣٤٦٢) ، والحاكم (٨١/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي ، وابن حبان (٧٤٦٠) وقال محققه :حدیث صحیح ، واللفظ للترمذي .

هاتووەﷺ کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت : ((...ثم الذين يلونهم على أضوا كوكب دري في السماء...)) [١٠٤] . واتە: ((پاشان ئەوانەی کە بەدوایاندا دێن بۆ ناو بەهەشت بەشێوەی درەوشاوە ترین ئەستێرەی پرشنگدار لە ئاسماندا دەکرێنە ناوی)).وە کاتێ کە دەگەنە بەر دەرگای بەهەشت لە دوو سەرچاوەی ڕووباری بەردەوام لێی ڕۆیشتوو دەخۆنەوە وە چی ناڕەحەتی و ناخۆشی هەیە لەناو سکیاندا دەڕوات و پاك دەبنەوە وە پاشان نیعمەتەکانیان پێ دەبەخشرێت وەکو ئیمامی عەلی ﷺ دەفەرموێت : ((يساق الذين اتقوا ربهم الى الجنة زمرا حتى اذا انتهوا الى باب من ابوابها وجدوا عنده شجرة يخرج من تحت ساقيها عينان تجريان فعمدوا الى احداهما كأنما أمروابها فشربوا منها فأذهبت مافي بطونهم من أذي وقذي أو بأس ثم عمدوا الى الاخرى فتطهروا منها فجرت عليهم بنضرة النعيم فلن تتغير أبشارهم تغيراً بعدها أبداً ، ولن تشعث أشعارهم كأنما دهنوا بالدهان ، ثم انتهوا الى خزنة الجنة فقالوا : سلام عليكم طبتم فادخلواها خالدين ......))[١٠٥] . واتە: ((ئەو کۆمەڵانەی کە لە خوا ترساون و تەقوا و ملکەچی خوایان کردووە بەڕێ دەکرێن بۆ بەهەشت کاتێ کە دەگەنە بەر دەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشت لەوێدا درەختێك دەبیننەوە لەژێر درەختەکەدا دوو سەرچاوەی ڕووبار دەڕوات دەچن بۆ لای ڕووبارێکیان وەکو فەرمانیان پێ کرابێت وە لێی دەخۆنەوە چی لەناو سکیاندا هەبووە لە ئازار و ناڕەحەتی تیایدا نامێنێت ، پاشان دەچن بۆ ڕووبارەکەی تریان وە پێی پاك دەبنەوە ، وە گەش و جوان دەبنەوە ڕویان لە دوای ئەوەوە قەت گۆڕانکاری بەسەردا نایەت . وە قژیشیان بژو ئاڵۆسکاو نابێت وەکو ڕۆنی لێ درابێت وایە ، پاشان دەگەنە لای دەرگاوانی بەهەشت وە پێیان دەڵێت : سڵاوی خواتان لێ بێت بچنە ژوورەوە بە هەتاهەتایی...)) ، وە قەرەباڵغیەك دروست دەبێت لە بەردەم دەرگای بەهەشت دا تاوەکو

---

[١٠٤] اخرجه : البخاري (٣٣٢٧) ، ومسلم (٢٨٣٤) .

[١٠٥] أخرجه :الطبري ((التفسير)) (٢٣٣١٧) ، وابن أبي الدنيا ((صفة الجنة)) (٨) موقوفاً ، والبيهقي ((البعث)) (٢٤٦) ، وابن أبي شيبة (٣٣٩٩٣) و أبونعيم ((صفة الجنة)) (٢٨٠-٢٨١) ، وابن كثير ((نهاية البداية)) (٢/١٢٦) ، وقال الحافظ ابن حجر ((المطالب العالية)) (٤٥٩٢) : هذا حديث صحيح وحكمه حكم المرفوع اذ لا مجال للرأي في مثل هذا ،وقال البوصيري ((اتحاف الخيرة المهرة)) (١٠٢٠٨): رواه اسحاق بن راهوية بسند صحيح وحكمه حكم المرفوع ، و اقره السيوطي في ((الدر المنثور)) (٧/٢٦٣) ، و ضعفه الشيخ الالباني في ((ضعيف الترغيب)) (٢١٨١) ، و ((الضعيفة)) (٦٧٢٤) ، واوردته للعلم و الا عتبار فقط.

خۆیان ئامادە بکەن بۆ چوونە ژورەوە ، وەکو لە فەرموودەکەی عوتبەی کوڕی غەزوان دا ﷺ دەفەرمویّت : ((......**ولقد ذُكر لنا ان مصراعين من مصاريع الجنة بينهما مسيرة أربعين سنة ، ليأتينّ عليه يوم وهو كضيظ* من الزحام** ..))[١٠٦]. واتە: ((پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کردوین کە ماوەی نێوان دوو دەرگای بەهەشت ڕێگەی چل ساڵە و ڕۆژێك دێت بەسەریدا کەزۆرچڕو قەرەباڵغ دەبێت ...)) . وەکاتێ باوەڕداران نزیك دەبنەوە لە دەرگاکانی بەهەشت ، فریشتەکان لەو دەرگا تایبەتیانەوە بانگیان دەکەن کە تایبەتە بەخۆیان و لەوێوەی دەچنە ژوورەوە بەپێ ی کردارە چاکەکانیان ، بگرە تیایاندایە هەیە لە هەموو دەرگاکانەوە بانگ دەکرێت ، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردۆتەوە لەفەرموودەکەی ئەبو هورەیرەوە ﷺ کە دەفەرمویّت : ((**من انفق زوجين ... من المال مما يملك** ...))[١٠٧] **في سبيل الله [ قيل : ومازوجان ؟ قال فرسان من خيله ، بعيران من أبله، عبدانِ من رقيقه ]**[١٠٨] **[حتي عدَّ اصناف المال كلُه]**[١٠٩] **نودي من أبواب الجنة :ياعبدالله [ يامسلم ]هذا خير ، فمن كان من أهل الصلاة دُعي من باب الصلاة ،ومن كان من أهل الجهاد دُعي من باب الجهاد ، ومن كان من أهل الصيام دُعي من باب الرَّيان ،ومن كان من أهل الصدقة دُعي من باب الصدقة. فقال أبو بكر ﷺ . يارسول الله بابي أنت وأمي هل يدعي أحد من تلك الابواب لكها؟ قال :نعم و أرجو أن تكون منهم))**. ووتیان : ((جوتێك یان دوان چیە؟ فەرمووی: دوان لەئەسپەکانی یا خود دوان لەحوشترەکانی یاخود دوان لە کۆیلەکانی)) واتە: ((هەرکەسێك ((...جووتێك لەو ماڵ وسامانەی کە هەیەتی لە پێناوی خودادا بیبەخشێت...)) یا دووان لە ووشترەکانی یاخود دوو کۆیلە لە کۆیلەکانی )) ((......هەتاوەکو هەموو جۆرەکانی سامانی ژمارد)). ئەو کەسە لە دەرگاکانی بەهەشتەوە بانگ دەکرێت ، ئەی بەندەی خوا ((.....ئەی موسوڵمان...)) ئەمە خێرە ، هەرکەسێك لە خاوەنی نوێژ بێت لە دەرگای نوێژکردنەوە بانگی

---

* كضيظ : ممتلئ ومزدحم .

[١٠٦] أخرجه: مسلم (١٠٢/١٨) بشرح النووي، وأحمد (٢٠٠٢٥) وقال محققه : اسناده حسن

[١٠٧] في رواية ابن حبان (٤٦٤٢) وقال محققه : اسناده صحيح .

[١٠٨] عند ابن حبان (٤٦٤٤) وقال محققه :إسناده صحيح ، وهو من حديث أبي ذر .

[١٠٩] عند ابن حبان (٤٦٤٥) :صحيح.

لیٚ دەکریٚت وە هەرکەسێك خاوەنی جیهادکردن بیٚت ئەوا لە دەرگای جیهادەوە بانگی لیٚ دەکریٚت وە هەرکەسێك خاوەنی ڕۆژوو بیٚت ئەوا لە دەرگای ڕەیانەوە بانگی لیٚ دەکریٚت ، وە هەرکەسێك خاوەنی خێروچاکە کردن بیٚت ئەوا لە دەرگای چاکەکردنەوە بانگی لیٚ دەکریٚت. پاشان ئەبوبەکری صدیق ﷛ فەرموی : ئەی پێغەمبەری خوا دایك وباوکم بەقوربانت بیٚت ئایاکەس هەیە لە هەموو دەرگاکانەوە بانگی لیٚ بکریٚت ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بەڵیٚ هیوام وایە تۆ یەکێك بیت لەوانە))[١١٠].

وە لای دەرگاکانی بەهەشت منداڵی باوەڕدارەکان کە بە منداڵی مردوون چاوەڕوانی دایك و باوکیان دەکەن وە دەرگای بەهەشتیان بۆ دەکەنەوە ،وەك لە فەرموودەکەی معاویەدا ﷛ هاتووە کە دەفەرمویٚت : ((ان رجلا كان يأتي النبي ﷺ ومعه ابن له ، فقال له النبي ﷺ : **اتحبه ، فقال : يارسول الله احبك الله كما احبه ، ففقده النبي ﷺ فقال : مافعل ابن فلان ، قالوا يارسول الله مات ، فقال النبي ﷺ لابيه : أما تحب ان لاتأتي باباً من أبواب الجنة الا وجدته ينتظرك ((الا وجدته قد سبقك اليه يفتحه لك))**[١١١] . واتە: ((پیاوێك دەهاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وکوڕەکەی لەگەڵ خویدا دەهێنا ، پێغەمبەر ﷺ پیٚی فەرموو : ئایا خۆشت دەویٚ ؟ ئەویش ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندەی کەمن ئەم کوڕەم خۆشم دەویٚت خوای گەورەش تۆی ئەوەندەی خۆش بویٚت.پاشان ماوەیەك دیارنەما پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە کوڕی فلاٚن کەس چی بەسەرهات ؟ ووتیان : مرد ئەی پێغەمبەری خوا ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە باوکی فەرموو ئایا پیٚت خۆش نی یە لە هەر دەرگایەکی بەهەشتەوە بچیٚت ببینیت کوڕەکەت چاوەڕیٚتە ((یاخواد ببینیت پیٚشت کەوتووە ودەرگای بەهەشتت بۆ دەکاتەوە)).((**فقال رجل : يارسول الله أ له خاصة أو لكلنا ؟ قال : بل لكلكم** ))[١١٢]. واتە: ((پیاوێك ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا هەر تایبەتەبەوەوە ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر ئەوە بۆ هەمووتانە)) .وە ئەو منداڵانە دەستی دایك وباوکیان دەگرن تا

---

[١١٠] اخرجه : البخاري (٣٦٦٦) ومسلم (١٠٢٧) ، والنسائي (١٦٨/٤) .

[١١١] من رواية النسائي (١١٨/٤)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي))(١٩٧٤).

[١١٢] اخرجه :احمد (٣٥/٥) والنسائي (١١٨/٤)،والحاكم (٣٥/٥) وصححه ووافقه الذهبي ، وصححه الشيخ الألباني في ((المشكاة)) (١٧٦٥) و ((احكام الجنائز)) (ص :١٦٢).

دەیانخەنە ناو بەهەشتەوە ، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفـەرموێت : ((**صـغارکم دعـا مـیص*** **الجنة يتلقى أحدهم أباه أو قال أبويه ، فيأخذ بناصية ثوبه أويـده ، كمـا أخـذ أنـا بـصنفه*** **ثوبك هذا ، فلا يتناهى حتى يُدخله الله وايّاه الجنة**)) [١١٣] .واتە: ((منداڵەکانتان گەشـتیاری ناو بەهەشتن هەریەکێکیان کە بە باوکی یاخود باوك و دایکی دەگات دامێنی کراسەکەی یاخود دەستی دەگرێت ، وەکو چۆن من دامێنی کراسەکەی تۆ دەگرم بەری نادات تاوەکو خوای گـەورە هەردووکیان دەخاتە ناو بەهەشتەوە)).وەبێگومـان ئەو منداڵانـەش دەگرێتـەوە کـە بەکۆرپـەیی لەسـکی دایکیـان کەوتونەتـە خـوارەوە و مـردون ، وەکـو لـە فەرمودەکـەی مـەعازدا ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێت : ((**والـذي نفـسي بيـده ان الـسقط ليجُـر أمـه بسرره*** **الى الجنة ، اذا احتسبته** ))[١١٤] واتە: ((سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەو منداڵە کۆرپەیەی کەلە سکی دایکی کەوتۆتە خوارەوە و لە بارچووە و ومردووە بـەو( وێلاّشـە) پەتـەی کەبەناوکی یەوە بەستراوە دایکی ڕادەکێشێت بۆ ناو بەهەشت ئەگەر ئارام بگرێـت لەسـەری)) . لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : ((**يقال لهم : ادخلوا الجنـة ؟ فيقولـوا حتـى يجـيءَ آبوانـا ، فيقال : دخوا الجنة أنتم و آباؤكم**))[١١٥]. واتـە: پێیـان دەوترێـت : بـچنە نـاو بەهەشـت ؟ ئەوانیش دەڵێن نا تا (دایك و باوك)مان دێن ، ئەنجا پێیان دەترێت: بچنە ناو بەهەشتەوە خۆتان ودایك وباوکتان)) وەکاتێ موسوڵمانان کە چونە نـاو بەهەشـتەوە ، هەرکەسـێك لـەوان دەڕوات بۆلای کۆشك وتەلاری خۆی کە بۆی ئامادەکراوە، وەماڵی خۆی دەناسێتەوە وەکو چۆن لـەدنیادا ماڵی خـۆی دەناسـێت ، وەکـو لەڕیوایەتەکـەی ئـەبو سـەعیدی خـودری ﷺ دەیگێڕێتـەوە کـە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((**والذي نفسي بيده ان احدهم بمنـزله أهدى منه بمـسكنه كـان في الدنيا**))[١١٦]. واتە: ((سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە هەر یەکێك لـە بەهەشـتیەکان

---

* دعا ميص : هي دويبة صغيرة تعيش في الماء والمعنى صغار سياحون في الجنة .

* صنف : طرف الثوب .

[١١٣] مسلم (٢٦٣٥) .

* سرر : حبل المشيمة .

[١١٤] اخرجه :ابن ماجة (١٦٠٩) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح ابن ماجة)) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٦٥٣٥).

[١١٥] أخرجه : أحمد ((المسند)) (٦٢٢٢٢) وقال محققه : اسناده صحيح على شرط البخاري و مسلم.

[١١٦] اخرجه :البخاري (٦٥٣٥).

جێگە و خانووی خۆی دەناسێت وەکو چۆن لە دنیادا جێگەو خانووی خۆی ناسیوە)) .وە هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿وَيُدۡخِلُهُمُ ٱلۡجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمۡ ۝٦﴾ ( محمد: ٦ ) .واتە: دەیانکاتە ناو ئەو بەهەشتەی کە پێی ناساندوون.

# باخ و بێستانەکانی ناو بەهەشت

بێ گومان لەناو بەهەشتدا باخ و باخاتی زۆری تێدایە ، وەکو لەفەرموودەکەی دایکی حاریسەدا‌ ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : ((...**یا أم حارثة انها جنان في جنة وان ابنك أصاب الفردوس الاعلى** ))[117] واتە: ((ئەی دایکی حاریسە لەناو بەهەشتدا باخ و بێستانی زۆرهەیە وە کوڕەکەی تۆ فیردەوسی هەرە بەرزی بەدەست هێناوە)). لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێت : ((**یا أم حارثة انها ليست بجنة واحدة، ولكنها جنان كثيرة وان حارثة لفي أفضلنها** ))[118]. واتە: ((ئەی دایکی حاریسە ناو بەهەشت تەنها یەك باخی تێدا نی یە بگرە چەندەها باخ وبێستانی زۆری تیایە حاریسەش لەناو باشترین باخیاندایە)). وە خوای گەورەش لەقورئانی پیروزدا ڕوونی کردۆتەوە کە لەناو بەهەشت دا چوار باخ و باخاتی تێدایە وەکو دەفەرمووێت : ﴿وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ۝٤٦﴾ (الرحمن: ٤٦) ، وەهەروەها دەفەرمووێت : ﴿وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ۝٦٢﴾( الرحمن: ٦٢) ، وە پێغەمبەری خواش ﷺ باسی ئەو باخ و باخاتانەی لەفەرموودە پیرۆزەکانیدا ڕوون کردۆتەوە کە دەفەرمووێت : ((**جنتان من فضة انيتهما وحليتهما وما فيهما ، وجنتان من ذهب انيتهما وحليتهما وما فيهما**))[119] واتە: ((دوو باخیان لە زیوە لەگەڵ هەموو ئەو لوپەلەکانی ناوی ، وە دووباخەکەی تریان لە ئاڵتونە لەگەڵ هەموو ئەو کەلوپەل و پێداویستیەکان ناوی )). وە ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێت : ((﴿وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ۝٤٦﴾ : **جنتان من ذهب للسابقين** ،

---

[117] اخرجه : البخاري ((الصحيح)) (٢٨٠٩).

[118] اخرجه : احمد امام أهل السنة والجماعة في ((المسند)) (١٢٤/٣) ، وابن سعد ((الطبقات)) (٥١٠/٣) ، وقال الشيخ الالباني في ((سلسلة الاحاديث الصحيحة)) (١٨١١) : سنده صحيح على شرط مسلم .

[119] اخرجه : الدرامي ((المسند)) (٢٨٢٢) ، والبخاري ((الصحيح)) (٤٨٧٨) ، ومسلم ((الصحيح)) (١٨٠) ، واحمد ((المسند)) (٤١١/٤) ، والترمذي ((السنن)) (٢٥٢٨) ،واللالكائي (٦٩٧) .

وجنتـان مـن فـضة للتـابعين ))[١٢٠] واتـه : دووبـاخی ئـاڵتونی بـۆ پـێش کەوتوانـه (واتـه: صەحابەکان) و دوو باخی زیوویش بۆ شوێن کەوتوانی ئەوان (واته: تابعين ))).

وه زانای پایه بەرز ئیبن و قەیم (رحمه الله)کە لەکتێبە بەنرخەکەی (حادي الارواح ) دا باسـی گـەورەی و چـاکیەتی دوو بەهەشـتی یەکـەم دەکـات لـه ده ڕووەوه بـه بـەراورد لەگـەڵ دوو بەهەشتەکەی دواهەمیندا)[١٢١] ، وه خوای گەوره له ناو بەهەشـتەکاندا بەهەشـتی عـەدنی بـه دەستی خۆی دروست کردوه وەك عەبدوڵای کوڕی عومەری کوڕی خـەطـاب ﷺ دەفـەرمـوێت : "خلق الله أربعة أشياء بيده : العرش ، القلم ، جنة عدن وادم عليه السلام ، ثم قـال لـسائر الخلق كن فكان" [١٢٢] واته: ((خوای گەوره چوار شتی بەدەستی خوی دروست کردوه : عـەرش وقەڵەم وبەهەشتی عەدن وئادەم ﷺ پاشان به هەموو دروستکراوەکانی خۆی فـەرموو: بـبن وه هەموو بوون)) وەخوای گەوره بەهەشتی عەدی داپۆشیوه و سەر ناوەتـەوه ، مـوەغیرەی کـوڕی شـعبة ﷺ دەگێڕێتەوه کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویەتی : ((سأل موسى عليه السلام ربه : مـا أدنى أهل الجنة منزلة ... قال : رب فاعلاهم منـزلة ؟ قال : أولئك الذين أردت غرسـت كرامتهم بيـدي وختمـت عليهـا ، فلـم تـر عـين ، ولم تـسمع أذن ، ولم يخطـر علـى قلـب بشر))[١٢٣]. واته: ((موسا ﷺ پرسیاری له خوای پەروەردگار کرد، کە نزمترین پلەی بەهەشت بۆ کێیه ؟ ...پاشان فەرمووی ئەی بەرزترین پله بۆ کێیه ؟ فەرمووی : ئەوانەی سامان و ڕێـز و جێگەیانم بۆ چاندون بەدەستی خۆم وه پاشان مۆرم پیا ناوه نەهیچ چاوێك بینویەتی و نـەهیچ گوێچکەیەك بیستویەتی وه قەت به دڵی کەسدا نەهاتووه)).

وەلەئیبن و عـەباسەوه ﷺ دەفەرموێت : ((اتخذ الله لنفسه جنة ثم اتخذ دونها أخرى ، حتى أطبقها بلؤلؤة واحدة وهي التي لا تعلم الخلائق مافيها ، وهي الـتي قـال تعـالى: ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ

---

[١٢٠] اخرجه : الحاكم ((المستدرك)) (٨٤/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي .

[١٢١] انظر: ((مختصر حادي الارواح)) (ص:٨٩).

[١٢٢] اخرجه : الحاكم ((المستدرك)) (٣١٦/٢) وصححه ووافقه الذهبي ، واللالكائي ((شرح اعتقـاد اهـل السنة والجماعـة)) (٩٧/١)، وابي نعيم ((صفة الجنة)) (٥٠) ، وقال الشيخ الالباني في ((مختصر العلو)) (ص: ١٠٥) :اسناده صحيح على شرط مسلم ، وفي رواية قال بن جـابر ﷺ: ((.. غـرس الله الجنـة بيده و جعـل ترابهـا الـورس والزعفـران وجعـل جبالهـا المسك، وخلق آدم بيده وكتب التوراة لموسى ) . أخرجه : هناد((الزهد)) برقم (٤٦) وقال محققه : اسناده صحيح.

[١٢٣] اخرجه : مسلم ((الصحيح)) (٣١٢) .

نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ... ﴿١٧﴾ ﴾ يأتيهم منها كل يوم تحفة)) [١٢٤].((واتە: خـوای گـەورە یەکێك لە بەهەشتەکانی بەدەستی خۆی دروست کردووە وپاشان بە مرواریەك سەری ناوەتـەوە و کە هیچ دروست کراوێك نازانێت چی تیایە ، ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ... ﴿١٧﴾ ﴾ (السجدة: ١٧) هەموو ڕۆژێك لە لایەن خـواوە جـوانتر و ڕازا وەتر دەبێت)) .

وە لەکەعبی کوڕی مـالیکەوە ﷺ دەفەرموێت : ((إنَّ الله جلَّ ذکره خلق دارا جعل فيها من الازواج و الثمرات و الاشربة ، واطبقها فلم يرها أحدٌ مـن خلقـه لا جبريـل ولاغـيره مـن الملائكة ثـم قـرأ ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ.... ﴿١٧﴾ ﴾(السجدة: ١٧) )) [١٢٥] . واتە: ((خوای پەروەردگار بەهەشتێکی دروست کردووە هەرچـی هەیـە لـەئافرەت و بـەروبووم و خواردنەوەیە تیایدایە وە سەری ناوەتەوە هیچ لەدروستکراوەکانی نە یـان بینیـوە نـە جبریـل و نەغیری جبریل لەفریشتەکان ، پاشان کـەعب ﷺ ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ.... ﴿١٧﴾ ﴾ (السجدة: ١٧) واتە: هیچ نەفسێك نازانێت چیان بۆ شاراوەتەوە لە بەختەوەری)).وەئەم بەهەشتەش لەبەهەشتی عەدنە ، وەکو ئەبو هـوڕەیرە ﷺ دەیگێڕێتـەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((... وما بين القوم وبين أن ينظروا الى ربهـم تبـارك وتعـالى الارداء الكبرياء على وجهه في جنة عدن ))[١٢٦] واتە: ((...لەنێوانی ئەوان و نێوان ئەوەی کە سەیری خوای پەروەردگاریان بکەن تەنها پەردەپۆشیٚ شکۆ و گەورەییە لەسەر ڕووی لە بەهەشتی عەدندا)). وە ئەم بەهەشتە تایبەتە بە ئەوانەی کە خوای گەورە لە فەرموودەیـەکی قودسـی دا باسیان دەکات و دەفەرموێت : ((أعددت لعبادي الصالحين مالا عين رأت ولا أذن سمعت ولا

---

[١٢٤] اخرجه:الحاكم (٢/٤٧٥) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي وقال محققه (٣٨٢٧):سنده صحيح على شرط البخاري.

[١٢٥] أخرجه : الطبراني ((المعجم الكبير)) (٩٧٦٣) ، والحاكم ((المستدرك)) (٢/٣٧٦) وصححه ووافقـه الـذهبي ، وصـححه الشيخ الالباني في ((مختصر شرح العقيدة الطحاوية)) (ص: ٦٤) ، وفي ((مختصر العلو)) (ص: ١١٠) .

[١٢٦] أخرجه : البخاري ((الصحيح)) (٤٨٧٨) ، ومسلم ((الصحيح)) (١٨٠) ، وعن ابن مسعود ﷺ قال : ( جنات عدن بطن الجنة [أي : وسط]) . أخرجه: ابن المبارك (١٢٨) ، والطبراني (١١/١١٠) ، و هناد ((الزهد)) (٤٨) وقال محققه : اسناده صحيح.

خطر علی قلب بشر...))[١٢٧] واتە: ((ئامادەم کردووە بۆ بەندە چاکە خوازەکانم لەوەی کە نەچاو بینیویتی ونە گوێ بیستوێتی ونەبەدڵی هیچ کەسێکیشدا هاتووە ...)).سەیری ئەم بابەتەبکە بەفراوانی لەکتێبی ((التذکرة))دا (٣٥٩/٢).

# قسەکردنی بەهەشت

بەهەشت دروست کراوێکە لە دروست کراوەکانی خوای پەروەردگار و هێناویەتە قسەکردن وەکو چۆن هەموو شتێکی تری هێناوەتە قسەکردن ، وەکو لەفەرموودەکەی ئەبو هورەیرە دا هاتووە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (([((اختصمت النار والجنة)) فقالت النار : اوثرت بالمتكبرين والمتجبرين ، وقالت الجنة : مالي لايدخلني الا ضعفاء الناس وسقطهم وعجزهم ، فقال الله سبحانه للجنة انت رحمتي ارحم بك من اشاء من عبادي ، وقال للنار : انت عذابي اعذب بك من اشاء من عبادي ولكل واحدة منكما ملؤها ][١٢٨]))...)) واتە: [((بەهەشت و دۆزەخ بوو بە دەمەقاڵێ یان دۆزەخ ووتی : بۆ چی هەر خۆ بە زل زان و زۆردارەکان فرێ دەدرێنە ناو منەوە ، وەبەهەشتیش ووتی : بۆچی منیش هەر لاواز و هەژار و پەك کەوتەکان نەبێت هیچ کەسێکی تر نایەتە ناو من ، خوای گەورەش بە بەهەشتی فەرمو‌و تۆ ڕەحمەتی منیت ڕەحم بەوبەندانەم دەکەم کەخۆم دەمەوێت ،وەبە دۆزەخی فەرموو : تۆ سزای منیت دەتکەمە سزا بۆ ئەو بەندانەی کە خۆم دەمەوێت وە هەردوولاتان دەبێت پڕ بکرێن)) ].
وە لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من سأل الله الجنة ثلاثاً قالت الجنة : اللهم أدخله الجنة))[١٢٩] واتە : ((هەرکەسێك داوای بەهەشت بکات لەخوا سێ جار ئەوا بەهەشت دەڵێت : ئەی پەروەردگار بیکەرە ناو بەهەشتەوە)). وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : ((الا قالت الجنة : یارب أنّ عبدك فلاناً سألني ، فأدخله الجنة))[١٣٠] . واتە: ((بەهەشت دەڵێت : ئەی پەروەردگار فلاّن بەندەی تۆ داوای منی کرد ، تۆش بیکەرە ناو

---

[١٢٧] اخرجه : البخاري ((الصحيح)) (٤٧٨٠) .

[١٢٨] اخرجه البخاري ((الصحيح)) (٧٤٤٩-٤٨٥٠)، واللالكائي (٧٢٠).

[١٢٩] اخرجه :الترمذي ((السنن)) (٢٧٥٢) ، وانظر :الهامش (٥٧٩) .

[١٣٠] اخرجه :ابو يعلى ((المسند)) (٦١٩٢) ، وصححه المنذري ((الترغيب)) رقم (٥٣٤٣) ، وصححه ايضا الشيخ الألباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٢٥٠٦) .

بەهەشتەوە)). وە بەهەشت خۆی تامەزرۆی بەندە چاکخوازەکانە ، لەئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((انّ الجنة لتشتاق الى ثلاثة علي وعمار وسلمان)) واتە: ((بەهەشت موشتاقی سێ کەسە عەلی و عەممارو سەلمان (رضي الله عنهم)))[131].

لەریوایەتێکی ئەبو سەعیدی خدری دا ﷺ دەفەرموێت : ((ان الله أحاط الجنة لبنة من ذهب ولبنة من فضة وغرس عرشها بيده ، وقال لها تكلمي فقال : قد أفلح المؤمنون[ فلما نظرت الملائكة الى حسنها قالت : طوبى لك منازل الملوك]))[132] . واتە: ((خوای گەورە دیوارەکانی بەهەشتی دروست کردوە بەخشتی ئاڵتون وزیو وەعەرشەکەی بەدەستی خۆی داناوە وەپێشی فەرموو قسە بکە؟ ئەویش ووتی : بڕواداران سەرفراز بوون [ کاتێك فریشتەکان تەماشای جوانی بەهەشتیان کرد پێیان ووت: مژدەت لێ بێت ئەی جێگەی پادشاکان])).

## ناوی بەهەشتیەکان

خوای گەورە ناوەکانی ئەهلی بەهەشتی لەکتێبی زۆر بەرزدا تۆمارکردووە ، وەکوخوای گەورە خۆی دەفەرموێت : ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ ١٨﴾( المطففين: ١٨) وەزیاتر مەعناکەی لەم فەرموودەیەی پێغەمبەردا ﷺ روون دەبێتەوە .

لەبەراءی کوڕی عازەبەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((...حتى ينتهي به الى السماء السابعة ، فيقول الله عزوجل : اكتبوا كتاب عبدي في عليين ... فيكتب كتابه في عليين ... فيقول الله عزوجل : اكتبوا كتاب عبدي في سجين في الارض

[131] اخرجه :الترمذي ((السنن)) (٣٧٩٧) وقال حسن غريب ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٩٨٦)، وفي ((صحيح الجامع)) (١٥٩٨).

[132] اخرجه: البزار ((المسند))(٣٥٠٩) ، والطبراني ((معجم الاوسط)) (٥٦٤٨) ، وقال الحافظ المنذري ((الترغيب والترهيب))(٩٥٢/٤) ، رواه الطبراني في ((الكبير)) و((الاوسط)) باسنادين واحدهما جيد ، وكذالك قال الهيثمي ((المجمع الزوائد)) (٣٩٧/١٠) ، وضعف الشيخ الألباني الحديث مرفوعا –كمافي ((سلسلة الاحاديث الضعيفة)) (١٢٨٣–١٢٨٤)، وصحيح اسناده موقوفا الحافظ العراقي في ((المغني)) (٤١٩٩)، وصححه ايضاً ابن القيم في ((حادى الأرواح)) كمافي ((مختصره)) ، (ص: ٢٤٩) ، وقال الشيخ الألباني في ((سلسلة الاحاديث الصحيحة)) (٢٦٦٢) :اسناده صحيح على شرط مسلم موقوفا ، وانظر ((صحيح الترغيب)) (٣٧١٤).

السفلی .......))[١٣٣] واتە: ((تاکو ڕوحی مردووەکە دەگەیەنرێتە ئاسمانی حەوتەم ، خوای گەورە دەفەرموێت : ناوی ئەم بەندەیم بنوسن لەکتێبی هەرەبەرزدا .......وە دەنوسرێت لەتۆمارگەی هەرەبەرزەکاندا .......وەخوای گەورە سەبارەت بەڕوحی بێ باوەڕ دەفەرموێت : ناوی ئەم بەندەیەم لەتۆمارگەی (سجین) لە هەر خواروی زەویدا تۆماربکەن .......)). وە ناوەکانی ئەهلی بەهەشت ناوی باوکیان و هۆزەکانیان لەگەڵ نوسراوە وەمۆری لێ دراوە نەلێی زیاد دەکرێت وە نەلێی کەم دەکرێت ، لەعەبدولای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەفەرموێت :

((خرج علینا رسول الله ﷺ وفي یده کتابان فقال : ... للذي في یده الیمنی )) . واتە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆلامان وە دووکتێبی بەدەستەوەبوو وەفەرمووی .......بەوکتێبەی کەبەدەستی ڕاستی یەوەبوو ((هذا کتاب من رب العالمین فیه اسماء أهل الجنة وأسماء أبائهم وقبائلهم ، ثم اجمل علی اخرهم فلا یزاد فیهم ولاینقص منهم أبداً))[١٣٤].

واتە: ((ئەمەکتێبی خوای پەروەردگارە – ناوەکانی ئەهلی بەهەشتی تیایە ناوی خۆیان وباوکیان وهۆزەکانیان پاشان هەڵگیراوە و کۆتایی پێ هاتووە نەلێی زیاد دەکرێت ونەلێشی کەم دەکرێت)) پێدەچێت لەوێدا پێغەمبەر ﷺ دوو کتێبی وەك نموونە نیشان دابن ، چونکە پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاه السلام ) ناوی بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکان و ژمارەیان نازانن . وەلەبەشی قەدەری شەرعیدا ئەگەر کۆمەڵە کردارێك هەبوو هەرکەس کردەوەی پێ کرد خوای گەورە لە ئەهلی بەهەشت ناوی تۆماردەکات ، وەك لەئەبی سەعدی خدرییەوەﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((خمس من عملهن في یوم کتبه الله من أهل الجنة : من عاد مریضاً ، وشهد جنازة ، وصام یوماً ، وراح یوم الجمعة واعتق رقبة ))[١٣٥] واتە: ((پێنج

---

[١٣٣] اخرجه :احمد ((المسند)) (٢٨٧/٤) ، وابوداود ((السنن)) (٤٧٥٣) ، والحاكم ((المستدرك)) (٣٧/١) وصححه ووافقه الذهبي ، وصححه الشيخ الألباني في ((احكام الجنائز)) (ص: ٢٠٢)

[١٣٤] اخرجه :احمد ((المسند)) (١١٧/٢) ، والترمذي ((السنن)) (٢١٤١) ، والنسائي ((التفسير)) (٤٩٣) وقال محققه : اسناده حسن ، وابن ابي عاصم ((السنة)) (٣٤٨)، وابو نعيم ((الحلية)) (١٤٨/٥) ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٧٤٠) ، وفي ((المشكاة)) (٩٦) ،وفي ((سلسلة الاحاديث الصحيحة)) (٨٤٨).

[١٣٥] اخرجه : ابن حبان ((الصحيح)) (٢٧٧١) وقال محققه :اسناده قوى ،ابویعلی ((المسند)) (١٠٤٤)، وقال الهیثمي ((مجمع الزوائد)) (١٦٩/٢) ، رواه ابویعلي و رجاله ثقات ، وصححه الشيخ الألباني في ((سلسلة الاحاديث الصحيحة)) (١٠٢٣)

كردارهەن هەركەسێك لەرۆژێكدا ئەنجامیان بدات ئـەواخوای گـەوره لەئـەهلی بەهەشـت نـاوی تۆمارده‌كات هەركەسێك سەردانی نەخۆشێك بكات وه ئامادەی بە رێ كردنی جەنازەیەك ببێـت وه ئەو رۆژه بەرۆژوو بێت وەنوێژی جومعە جێ بەجێ بكات وه بەندیەكی ئازاد بكات)).

## رێگای بەهەشت

گرتنی رێگەی بەهەشت بەشوێن كەوتنی پێغەمبەران دەبێت ﷺ وەبەتایبەتی پێغەمبـەری ئازیزو خۆشەویستی و پایە بەرزمان محمد ﷺ لە جابرەوه ﷺ دەفەرموێت : ((**جاءت ملائكة الى النبي ﷺ فقال بعضهم : انه نائم ، وقال بعضهم : العين نائمة والقلب يقظـان ، فقـالوا : ان لصاحبكم هذا مثلاً فاضربوا له مثلاً ، فقالوا : مثله كمثل رجل بنى داراً وجعل فيهـا مادبـة* وبعث داعياً ، فمن أجاب الداعي دخل الدار واكـل مـن المادبـة، ومـن لم يجـب الـداعي لم يدخل الدار ولم يأكل من المأدبة ، فقالوا : أولوها* له يفقهها فقال بعضهم : ...الـدار الجنـة والداعي محمد فمن أطاع محمداً فقد أطاع الله ، ومن عصى محمداً فقـد عـصى الله ، ومحمـد فرق* بين الناس**)) [١٣٦] واتە: ((هەندێ فریشتە هاتن بۆ لای پێغەمبـەری خوا ﷺ هەندێكیان ووتیان : ئەوه نوستوه هەندێكیشیان ، ووتیان نەخێر چاوی نوستووه بەلام دڵی بەئاگایە ووتیـان ئەو هاوەڵەتان نمونەیەكی بۆ بهێننەوه ، پاشان ووتیان : نمونەی ئەو وەكو نمونـەی پیاوێـك وایـە خانویەكی دروست كردبێت و سفره و خوانێكی تێـدا دروسـت كردبێـت و خـەڵكانی بـۆ بـانگ كردبێت گەر هەر كەسێك بێت بە دەنگی ئەو بانگ هێشتەوه ئەوا دێتە ئەو خانوەوه و لەو سفره و خوانە دەخوات ، بەلام گەر نەهات ئەوا نایەتە ئەو خانوەوه و لە وەلیمەكەش ناخوات ، پاشان ووتیان: ماناكەی بۆ لێك بدەنەوه تا تێ ی بگات ، هەندێكیان ووتیـان...خانوەكـە بەهەشـتە و بانگ خوازەكە محمده ﷺ هەر كەسێك گوێ رایەڵی پێغەمبەرﷺ بكات ئەوا گوێ رایەڵی خـوای كردووه وه هەر كەسێك سەر پێچی محمد بكات ﷺ ئەوا سەر پێچی خوای كردووه وه پێغەمبـەر

* مادبة : طعام الوليمة .
* اولوها : فسروها له حتى يفهمه .
* فرق : أي الايمان به يفرق بين الكافر والمؤمن .

[١٣٦] أخرجه : البخاري ((الصحيح)) (٧٢٨١) .

ﷺ جیاکەرەوەیە لە نێوان خەڵکان دا (واتە: باوەڕ هێنـان بـە پێغەمبـەر ﷺ و شـوێن کـەوتنی جیاکەرەوەی نێوان کافر و باوەڕدارە)).

بەڵام ئەو کەسانەی کە ناوی پێغەمبەریان ﷺ لاهێنراو سەڵاواتیان لەسەر پێغەمبەر ﷺ نـەدا ئەو کەسانە ڕێگەی بەهەشتیان وون کردووە ، لە ئەبو هورەیرە‌رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی : ((من ذكرت عنده فنسي الصلاة عليّ خُطـئ ( بـه ) طريـق الجنـة ))[١٣٧] واتە: ((هەر کەسێك ناوی منی لا ببرێت و لەبیری بچێت سەڵاوات لەسەر من بدات (ئەو کەسـە ڕێگەی بەهەشتی وونکردووە)) کەواتە سەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەیەکـە بـۆ چوونە بەهەشتەوە.

وە هەروەها فێربوونی زانستی شەرعیش یەکێکە لەڕێگەکانی تر بـۆ چـوونە بەهەشـتەوە : وەکو ئەبو هورەیرە‌رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((من سلك طريقاً يلتمس فيه علماً سهل الله له طريقاً الى الجنة ))[١٣٨] واتە: هەرکەسێك ڕێگەیەك بگرێتەبەر بۆ بەدەست هێنانی زانستێك ، ئەوا خوای گەورەش ڕێگەی بەهەشت بۆ ئاسان دەکات)) لەڕیوایەتێکی تردا: ((سلك الله به طريقاً الى الجنة ...))[١٣٩] واتە: ((خوای گـەورە بـە ڕێگەیەکـدا دەیبـات تـا دەیگەیەنێتە ناو بەهەشت ...))

# پـــلەکـــانی بەهـــەشـــت

پلـەکانی بەهەشـت جیـاوازن بـەپێی کردەوەکـانی مـرۆڤن ،خـوای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٢﴾ ﴾( الأنعـــام: ١٣٢) ، و ﴿ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ۖ وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ (الأحقاف: ١٩)، وە هەروەها خـوای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿ هُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٣﴾ ﴾( آل عمـران: ١٦٣)

---

[١٣٧] اخرجه :الطبراني ((المعجم الكبير)) (٢٨٧٧)، وابن ابي حاتم ((الصحيح)) (٢/١٩٤)، وقال الهيثمي ((مجمع الزوائد)) (١٠/١٦٤)... لـه شواهد يرتقي بها الى درجة الحسن ،وحسنه الشيخ الألباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٢٣٣٧)، وصححه لشواهده الشيخ شعيب الارناؤوط في تحقيقه على ((جلاء الافهام)) (٩٥).

[١٣٨] اخرجه : مسلم ((الصحيح)) ، والترمذي ((السنن)) (٢٦٤٦) ، وابن ماجة ((السنن)) (٢٢٥) ، وصححه الشيخ الالباني ((صحيح سنن الترمذي)) (٢١٣٤) .

[١٣٩] اخرجه : الترمذي ((السنن)) (٢٩٤٥) ، وصححه الشيخ الالباني ((صحيح سنن الترمذي)) (٢١٥٩) .

واته: ( ئەوانە هەر یەكێكیان پلەی خۆیان هەیە لای خوای گەوره ، و خـوای گـەورەش بینـەری كارەكانیانـە ) . وەجێگـە وشـوێنی موسـوڵمانان لـە نـاو بەهەشـت داجیـاوازە بـەپێی كـردە وەچاكەكانیان ،هەتا هەندێ لەجێگەكانی ئەهلی بەهەشت وەكو ئەستێرەیەكی دوور لـە ئاسمـان دەبینرێت چونكە بەهەشت سەدپلەیە و هەرپلەیەك وەك نێوانی زەوی وئاسمانـە كـە سەدسـاڵە . پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویت : ((في الجنة مائة درجة مابين كل درجتين مائـة عـام )) [١٤٠] واتـە: لەبەهەشت دا سەدپلە هەیە و نێوانی هەر دوو پلەیەكی بەهەشت ماوەی سەدسـاڵە)) .وە ئـەبو سەعیدی خدری ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (([ ((انّ أهـل الجنـة لـيتراؤن أهل الغرف من فوقهم كما يتراؤن الكوكب الدري الغابر* في الافق مـن المـشرق والمغـرب لتفاضل مابينهم)) ، قالوا : يا رسول الله تلك منازل الانبياء لايبلغها غيرهـم ، قـال : بلـى والذي نفسي بيده رجال امنوا بالله وصدقوا المرسلين]))[١٤١] واته: ((ئەهلی بەهەشت خـاوەن كۆشـكەكانی نـاو بەهەشـت لەسـەر و خۆیانـەوە دەبیـنن ، وەكـو ئەسـتێرەیەكی پڕشـنگداری ڕۆیشتووە لە ئاسۆی ڕۆژهەلآت یان ڕۆژئاوای بەرزی ئاسماندا بەهۆی جیاوازی نێوان پلـەكانیان)) ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە جێگای پێغەمبـەرانن و كەسـی ترجگـە لـەوان پـیٚ ی ناگات ، فەرمووی: بەڵی سوێند بەوەی كە نەفسی منی بەدەسـتە ئـەوە پلـەی كەسـانێكە كـە باوەڕیان بەخوای خۆیان هـەبووە و پێغەمبـەرانیان بەڕاسـت زانیـووە)). وەخـوای پـەروەردگار دەفـــەرمویت : ﴿ سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢١﴾ ﴾(الحديـــــد: ٢١). واته: (پێشبڕكێ بكەن بۆلێخۆش بوونی خوا و دەست خـستی بەهەشـتێك كـە پانتایەكـەی وەك فراوانی ئاسمان و زەویە ئامادەكراوە بۆ كەسانێك كە بڕوایـان بـەخوا و پێغەمبـەركانی هێنـاوە

[١٤٠] اخرجه : الترمذي ((السنن)) (٢٥٢٩) وقال: حديث غريب ، وصححه الشيخ الألباني في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (١٩٢٤) ، وفي ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٠٥٤) .

* الدري : المضئ . الغابر : الذاهب الذي تدلى للغروب .

[١٤١] اخرجـه: البخـاري ((الـصحيح)) (٣٢٥٦) ، ومـسلم ((الـصحيح)) (٢٨٣١) ، واحمـد ((المـسند)) (٣٤٠/٥) ، وابـوداود ((السنن)) (٩٦) ، وابويعلى ((المسند)) (١١٣٠) ، وابن حبان ((الصحيح)) (٧٣٩٣) وقال محققه : صحيح .

ئەوەش بەخشینی خوایە و دەیبەخشێتە ئەوانەی کە خۆی ویستی لێیەتی خوای گەورەش خاوەنی بەخشینی هەرە گەورەیە).

وە پێغەمبەر موسا ﷺ پرسیاری لەخوای پەروەردگار کرد سەبارەت بە نزمترین پلەی بەهەشت وە بەرزترین پلەی بەهەشت ،وەکو لە فەرموودەکەی موغیرەی کوڕی شوعبەدا ﷺ هاتووە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((سأل موسى عليه السلام ربه : ما أدنى أهل الجنة منزلة ؟ قال : رجل يجئ بعدما دخل أهل الجنة فيقال له : ادخل الجنة ، فيقول : رب كيف وقد نزل الناس منازلهم واخذوا أخذاتهم ؟ فيقال له : أترضى أن يكون لك مثل: ملك من ملوك الدنيا ؟ فيقول : رضيت رب ، فيقول له : لك ومثله ومثله ومثله ، قال فقال في الخامسة :رضيت رب فيقول هذا لك وعشرة أمثاله، ولك مااشتهت نفسك ولذت عينك ، فيقول : رضيت ربي ، قال : رب فاعلاهم منزلة ؟ قال : اولئك الذين أردت غرست كرامتهم* بيديّ وختمت عليها ، فلم ترعين ، ولم تسمع أذن ، ولم يخطر على قلب بشر))[١٤٢] واتە: (( موسا ﷺ پرسیاری لەخوای پەروەردگار کرد کە نزمترین پلەی ئەهلی بەهەشت چەندە ؟ فەرمووی : پیاوێك دێت دوای ئەوەی کەئەهلی بەهەشت چوونە ناو بەهەشتەوە ، پێی دەوترێت بچۆرە ناو بەهەشت: ئەویش دەڵێت : چۆن ئەی پەروەردگار خەڵکان هەموو جێگە وبەشی خۆیان وەرگرتووە لە ناو بەهەشت دا ؟ پێی دەوترێت : ئایا ڕازی دەبیت تۆش بەوێنەی پاشایەك لەپاشاکانی دونیات پێ بدرێت؟ دەڵێت : بەڵێ ڕازیم ، خوای گەورەش دەفەرموێت : ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوندەی هاوشێوەی ئەو بۆ تۆ ، دەفەرموێت : لە پێنجەم جاردا دەڵێت: ڕازیم ئەی پەروەردگار ،خوای گەورەش دەفەرموێت : هەمووی بۆ تۆ لەگەڵ دە ئەوەندی تردا و چی نەفست پێی خۆشە و چاوت پێی خۆشە بۆت دابین کراوە ، ئەویش دەڵێت : ڕازیم ئەی پەروەردگار . پاشان پێغەمبەر موسا ﷺ فەرمووی پەروەردگار ئەی بەرزترین پلە بۆ کێ یە ؟ خوای گەورەش فەرمووی : بۆ کەسانێکن کەمن بەهەشتەکانیانم لەبەر ڕێزی ئەوان (بەدەستی خۆم دروست کردووە) و مۆرم بەسەردا ناوە وکەس نەیبینیوە وەکەسیش نەی بیستووە

---

* غرست كرامتهم : بنيت جنتهم بيديّ .

[١٤٢] اخرجه : مسلم ((الصحيح)) (٣١٢) .

وبەخەیاڵی كەسیشدا نەهاتووه)). وەبەرزترین پلەی ناو بەهەشت ((وەسیلە)) یە كە پلەی پێغەمبەری خوایە ﷺ لەعەمرِی كوڕی عاصەوه ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((اذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل مايقول ثم صلوا عليّ فأنه من صلّى صلاة صلىّ الله بها عشراً...... ثم سلوا الله لي الوسيلة فأنها منزلة في الجنة لاتنبغي الا لعبد من عباد الله وارجوا أن أكون أنا هو...))**[١٤٣] واتە: ((گەر گوێتان لەبانگ بێژ بوو چی ووت ئێوەش وەكو ئەو بیلێنەوە وپاشان سلاّواتم لەسەر بدەن هەركەسێك سەلاّواتم لەسەر بدات خوای گەورە دە سەلاّوتی لەسەر دەدات ......پاشان داوای وەسیلەم بۆبكەن چونكە وەسیلە جێگەیەكە لە بەهەشتدا كەس پێی ناگات جگە لە بەندەیك لە بەندەكان خودا ، هیوادارم ئەو شوێنە بۆ من بێت......)). لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرموێت : **((الوسيلة درجة عند الله عزوجل ليس فوقها درجة ...))**[١٤٤] واتە: ((وەسیلە پلەیەكە لای خوای گەورە كە لەسەر و ئەو پلەیەوە هیچ پلەیەكی تر نی یە ...)). ئیبنو عباس ﷺ لە وەسفی (وسیلە) و شوێنی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **((.. اعطاه (الله) في الجنة الف الف قصر في كل قصر ماينبغي له من الازواج و الخدام))**[١٤٥] . واتە: خوای گەورە هەزار كۆشكی بەخشیە پێغەمبەرەكەی لە هەموو ئەو كۆشكانەدا هاوسەر و خزمەتكاری تایبەتی تێدایە. وە وەسیلە لەسەرو فیردەوسە و فیردەوسیش لەسەروی بەهەشتەوەیە ، وەكو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : **((الجنة مئة درجة ... وان أعلاها الفردوس وان أوسطها الفردوس وان العرش على الفردوس))**[١٤٦] واتە: ((بەهەشت سەد پلەیە هەرە بەرزەكەی فیردەوسە و ناوەڕاستەكەشی فیردەوسە وە عەرشیش لەسەرو فیردەوسەوەیە)) .وە لە خوار وەسیلەوە شوێن و پلە و پایەی پێغەمبەران هەیە وە لەو شوێنەشدا شوێنی خۆشەویستی خوا پێغەمبەر ئیبراهیم ؑ لێ یە. لەئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە

---

[١٤٣] اخرجه: مسلم ((الصحيح)) (٣٨٥) ،أبوداود (٥٢٧) .

[١٤٤] اخرجه : احمد امام اهل السنة والجماعة في ((المسند)) (٨٣/٣) ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (٧١٥١) .

[١٤٥] أخرجه : الطبري ((التفسير))(٢٩٠٥١) ، وقال ابن كثير ((التفسير)) (٤٣١/٦) : اسناده صحيح ومثل هذا مايقال الاّ عن توقيف.

[١٤٦] اخرجه: ابن ماجة ((السنن)) (٤٣٣١) ، والحاكم ((المستدرك)) (٨٠/١) ، وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي ، و صححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٩٦) ، وفي ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (٩٢٢) .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((ان في الجنة قصراً من درّة لاصدع فيه ولا وهن* أعده الله لخليله ابراهيم ﷺ))[147] واتە: ((لەبەهەشت دا کۆشکێك هەیە لەمرواری دروست کراوە بە بێ ئەوەی هیچ شکاویەکی بێت خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ ئیبراهیم ﷺ)).

وە نزمتر لە شوێن و جێگەی پێغەمبەران شوێن و جێگەی شەهیدان و ڕاستگۆیانە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((ان الرجل من أهل الجنة ليشرف على أهل الجنة كأنه كوكب دريّ ، وان أبابكر وعمر لمنهم وأنعما))[148] واتە: ((یەکێك لەکەسانی بەهەشت لە جێگە بەرزەکەی خۆیەوە تەماشای خوارەوە دەکات و سەیری ئەهلی بەهەشت دەکات وەکو ئەستێرەیەکی پرشنگدار بەدی دەکەوێت و ئەبو بەکر وعومەر بەشادیەوە لەوانن)).

ڕاستگۆیان ئەو دۆستانەی خوان کە پارێزگاریان لە بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی ئاینی خوایان کردووە ، عومرەوی کوڕی مورەی جوهەنی ﷺ دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ((جاء رجل الى النبي ﷺ فقال : يارسول الله ، أرأيت ان شهدت ان لااله الا الله ، وأنك رسول الله، وصليت الصلوات الخمس ، وأديت الزكاة ، وصمت رمضان وقمته ، فممن أنا ، قال: ((من الصديقين والشهداء))[149]. واتە : ((پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ، گەر من شایەتی بدەم کە تەنها یەك خوا هەیە و تۆش پێغەمبەری خوایت وەنوێژە فەرزەکان ئەنجام بدەم و زەکات ببەخشم ، و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرم و شەو نوێژەکانی ئەنجام بدەم من لە کامانە دەبم ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((تۆ لە ڕیزی ڕاستگۆیان و شەهیدان دەژمێردرێت)).وە هەروەها بەڵگەی تر بۆ ئەمە ئایەتەکەی خوای گەورە کە

---

* درة لا صدع فيه ولا وهن : لؤلؤة لاكسر فيها ولا عيب .

[147] اخرجه : البزار ((المسند)) (٢٣٤٦) ، والطبراني ((معجم الاوسط)) (٢١٢٥) و رجالهما رجال الصحيح ، كما قال الهيثمي ((مجمع الزوائد)) (٢٠١/٨).

[148] اخرجه : احمد ((فضائل الصحابة)) (٧٠٦) وقال محققه : اسناده حسن ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (٢٠٢٦).

[149] اخرجه : البزار ((المسند)) (٢٠٧٩) ، وابن حبان ((الصحيح)) (٣٤٣٨) وقال محققه : اسناده صحيح على شرط الشيخين ، وقال ابن حجر الهيثمي ((مجمع الزوائد)) (٤٦/١) اسناده حسن اوصحيح ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٩٩٣).

دەفـــــــەرموێت : ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٩﴾ ﴾( الحديــد: ١٩) .وە لــــە ئایەتێکی ترداده‌فـەرموێت : ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴿٦٩﴾ ﴾( النساء: ٦٩ ).

# هەندێك لەو كەسانەی كەپلەی بەرزیان هەیە لەناوبەهەشتدا

## ١- ئەوانە كە جیهاد و خەبات دەكەن لە پێناوی خوای گەورەدا :-

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ و دەفەرموێت : ((.... **ان في الجنـة مائـه درجـة اعدها الله للمجاهدين في سبيل الله ، ما بين كل درجة كما بين السماء والأرض**.....))[١٥٠] واتە: لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە خوای گەورە ئامادەی كردوە بۆ موجاهیدەكان ئەوانەی كە لــە پێناوی خــوادا دەجــەنگن دژبــە دوژمنــانی بــیٚ بــاوەڕ وە نێــوانی هەرپلەیەكـدا وەك نێـوانی ئاسمانەكان و زەوی یــە .......)).وە هــەروەها ئــەو تیرهاوێــژە دڵــسۆزانەی لــە جــەنگی دژ بــە دوژمناندا تیریان هاویشتووە ئەوانیش لە پایە بەرزانی بەهەشتن .

ئەبی سەلەمەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((**من بلغ العـدو بـسهم ، رفعه الله به درجة ... اما انها ليست بعتبة* أمـك ولكـن مـابين الـدرجتين مائـة عـام**))[١٥١] .واتــە: ((هەركەســێك تیرێــك بگەیەنێتــە دوژمــن، ئــەوا خــوای گــەورە پلەیــەك بــەرزی دەكاتەوە...... بەڵام ماوەی نێوانی دووپلە سەدساڵە)).

---

[١٥٠] اخرجه :البخاري ((الصحيح)) (٢٧٩٠).

* العتبة : مايمسك الباب بالجدار .

[١٥١] اخرجه :النسائي ((السنن)) (٢٧/٦) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (٢٩٤٧) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٦٣٠٧).

کە تۆ خێزانم بیت لەدەنیا و لەڕۆژی کۆتایشدا)) ئەویش فەرمووی : بەڵێ ، وە پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : [ کەوابوو تۆ خێزانی منیت لە دونیا و لە ڕۆژی کۆتایشدا )). وە ئافرەتی موسوڵمان بۆ دوا مێردی دەبێت کە لە دونیادا لەگەڵی ژیاوە ،پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((ایما امرأة توفي عنها زوجها فتزوجت بعده فهي لآخر أزواجها )) [٢٩٥] واتە : ((هەر ژنێك مێردەکەی بمرێت و دوای ئەو شووبکاتەوە بۆ دوا مێردی دەبێت لە بەهەشت دا )).

چاکترینی ئافرەتانی دونیا لە بەهەشتدا چوار ئافرتن وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((أفضل نساء أهل الجنة خديجة بنت خويلد ، وفاطمة بنت محمد ، واسية بنت مزاحم أمراة فرعون، ومريم ابنة عمران )) [٢٩٦] واتە : (( باش ترین ئافرەتانی بەهەشت خەدیجەی کچی خولەیدە وفاطمەی کچی محمد ﷺ و ئاسیای کچی مزاحمی (ژنەکەی فیرعەون ) وە مەریەمی کچی عیمرانە )) . وە ئافرەتانێکی کەم دەچنە ناوبەهەشت ئەوەش بەهۆی ناڕازی بوونیان لە مێردەکانیان و زۆر بۆلەبۆڵەکردن و نەفرەت کردن و گلەیی کردنیان..... پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((اطلعت في النار فرأيت أكثر أهلها النساء ، واطلعت في الجنة فرأيت أكثر أهلها الفقراء )) [٢٩٧] واتە : (( جەهەنەمم نیشان درا بینیم زۆرینەی ئەهلەکەی ئافرەت بوون ، وە بەهەشتیشم نیشان درا بینیم زۆرینەی ئەهلەکەی هەژار بوون)) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((ان أقل ساكني الجنة النساء )) [٢٩٨] واتە : (( کەمترین نیشتە جێبوانی ناو بەهەشت ئافرەتانن)) بەلاّم لەڕاستدا ئافرەتان زۆرینەی خەڵکی بەهەشت و جەهەنەمن ئەویش بەهۆی زۆری ژمارەی حۆری عەینەکانەوەن لە ناو بەهەشتدان وە زۆرینەی ئافرەتانی دونیا کە لەناو ئاگردان :-

ئیبن و سیرین ﷺ دەفەرموێت : [...باسی ئەوە کرا ، ئایا پیاوان زۆرن لەناو بەهەشتدا یاخود ئافرەتان ؟ ئەبو هورەیرە ﷺ فەرمووی: ئایا پێغەمبەر ﷺ نافەرموێت: (( ان أول زمرة

---

[٢٩٥] اخرجه : الطبراني ((الاوسط)) (١/١٧٥) ، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٢٨١) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٢٧٠٤).

[٢٩٦] اخرجه : الطبراني ((المعجم الكبير)) (١١٩٢٨) ، واحمد ((المسند)) (٢٦٦٨) وقال محققه :اسناده صحيح، وابويعلى ((المسند)) (٢٧٢٢) ، والحاكم ((المستدرك)) (٣/١٨٥) وصححه ، وابن حبان ((الصحيح)) (٧٠١٠) .

[٢٩٧] اخرجه :البخاري ((الصحيح)) (٣٢٤١) .

[٢٩٨] اخرجه : مسلم ((الصحيح)) (٤/٢٠٩٧) ، وأحمد (١٩٩١٦) .

تدخل الجنة على صورة القمر ليلة البدر ... لكل امرئ منهم زوجتان اثنتان .. وما في الجنة أعزب ))[٢٩٩] واتە : (( یەکەم کۆمەڵ کە دەچنە ناو بەهەشت ڕویان لەسەر شێوەی مانگی شەوی چواردەن هەموو یەکێك لەوان بۆ هەموو کەسێك دوو ژنی دەبێت وە لە ناو بەهەشتدا کەسێك نی یە بیٚ ژن یاخود بیٚ مێرد بێت )) ].

## بازاڕی بەهەشت

خەڵکی بەهەشت بازاڕێکیان هەیە تێیدا کۆدەبنەوە و جوانیان زیاد دەکات ، پاشان دەگەڕێنەوە بۆلای هاوسەرەکانیان سەیردەکەن ئەوانیش جوانیان زیادی کردووە.

ئەنەس ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( ان في الجنة لسوقاً ياتونها كل جمعة ، فتهب ريح الشمال فتحثو في وجوههم وثيابهم فيزدادون حسناً و جمالاً . فيرجعون الى أهليهم وقد ازدادوا حسناً وجمالاً فيقول لهم اهلوهم : والله لقد ازددتم بعدنا حسناً وجمالاً ، فيقولون : والله وانتم لقد ازددتم بعدنا حسناً وجمالاً ))[٣٠٠] واتە : (( لە بەهەشتدا بازاڕێك هەیە و هەموو ڕۆژانی جومعەیەك دێن بۆ ئەو بازاڕە، و شنە بایەکی سەرو هەڵ دەکات و دێت بە ڕوویاندا و بەڕوخسار و بەرگ و پۆشاکەکانیاندا بلاٌودەبێتەوە و زیاتر پێست و ڕوخساریان جوانتر دەبێت و پاشان دەگەڕێنەوە لای هاوسەرەکانیان و دەبینن ئەوانیش پێست و ڕوخساریان جوانتر بووە ، و هاوسەرەکانیان پێیان دەڵێن : سوێند بە خوا ئێوە جوانتربوون ، ئەوانیش دەڵێن: وە سوێند بە خوا ئێوەش لە دوای ئێمە جوانتربوون)).لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : ((ان في الجنة لسوقاً يأتونها كل جمعة فيها كثبان المسك فيزدادون حسناً وجمالاً ...))[٣٠١] واتە : (( لە بەهەشتدا بازاڕێك هەیە و پڕە لە تەپۆلکەی میسك هەموو ڕۆژانێکی هەینی خەڵکانی بەهەشت دێن و زیاتر پێست و ڕوخساریان جوانتر دەبێت)) .وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : (( ان في الجنة سوقاً يأتونه كل جمعة فيه كثبان المسك ، فتهيج ريح الشمال ، فتحثي أو فتسقي في وجوههم المسك ... ))[٣٠٢] واتە: (( لە بەهەشتدا بازاڕێك هەیە هەموو ڕۆژانی هەینی یەك

---

[٢٩٩] اخرجه : البخاري ((الصحيح)) (٣٢٤٦،٣٣٢٧) ، ومسلم ((الصحيح)) (٢١٧٨/٤) .

[٣٠٠] اخرجه : مسلم ((الصحيح)) (٢٨٣٣) واللفظ له ، والدارمي ((السنن)) (٣٣٩/٢) .

[٣٠١] اخرجه : الدارمي ((السنن)) (٢٨٤١) ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (٢١٢٤) .

[٣٠٢] اخرجه : ابن حبان ((الصحيح)) (٧٤٢٥) وقال محققه :اسناده صحيح على شرط مسلم عن انس ﷺ مرفوعا .

خەڵکان دێن بۆ ئەو بازاڕە لە لای تەپۆڵکە میسکەکان شنە بای سەرو هەڵدەکات و گوڵاوی میسك دەپرژێنێت بە ڕوخسارياندا)) .

وەئەنەسی کوڕی مالك ﷺ دەفەرموێت : ((ان في الجنة سوقاً كثبان مسك ، يخرجون اليها ، ويجتمعون اليها فيبعث الله ريحان فتدخلها بيوتهم ... )) [٣٠٣] واتە : (( لە ناو بەهەشتدا بازاڕێك هەیە وپڕە لە تەپۆڵکەی میسك خەڵکان دەچنە دەرەوە بۆ ئەوێ و لەوێ کۆدەبنەوە خوای گەورە بایەکی بۆن خۆش دەنێرێت و دەیکاتە ناو ماڵەکانیانەوە )) .

وە هەروەها ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ دەفەرموێت : ((ان قائل اهل الجنة ليقول : انطلقوا بنا الى السوق فيأتون جبالاً من مسك فيجلبون فيتحدثون ))[٣٠٤] واتە : (( یەکێك لە خەڵکی بەهەشت دەڵێت : با بڕۆین بۆ بازاڕ دێن و لای شاخەکانی میسك کۆ دەبنەوە و قسە دەکەن...)).

## پۆشاکی خەڵکی بەهەشت

پۆشاکی خەڵکی بەهەشت ئاوریشمە ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ .....وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ (الحج: ٢٣ ) وە ئاوریشمی سەوزی جۆراوجۆری تیایە هەندێك تەنكە وهەێکیان ئەستورە ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ نِعْمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٣١﴾ ﴾ (الكهف: ٣١) ئیمامی موجاهد (رحمه الله) لە یەزیدەی کوڕی شەجەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (( ... يكسى مئة حلة ليس من نسيج ابن آدم ، ولكن من نبتِ الجنة لو وُضعِنَ بين أصبعين لو سعن....))[٣٠٥].واتە: بڕوادار سەد پۆشاکی نایابی بە بەردا دەکرێت کە هیچیان لە چنین و ڕستنی مرۆڤ نین بەڵکو لە درەختی ناو بەهەشتن ئەو سەد پۆشاکە لە ناکسیاندا گەر بکرێتە نێوان دوو پەنجەوە جێگەیان دەبێتەوە )).

---

[٣٠٣] اخرجه : احمد ((المسند)) (٣/٢٨٤) ، ومسلم ((الصحيح)) (٤/٢١٧٨) ، وعبدالله بن مبارك ((الزهد)) (٤١٩١).

[٣٠٤] اخرجه : ابن ابي شيبة ((المصنف)) (٣٤٠١٥) .

[٣٠٥] أخرجه: البزار (١٧١٤) ، والبيهقي ((البعث)) (٥٦٢) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (١٣٧٧).

خۆشەویستترین ڕەنگ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی سەوز بوو ، ئەنەس رضي الله عنه دەفەرمووێت : ((کان أحب الالوان الی رسول الله ﷺ الخضرة ))[٣٠٦] واتە : ((خۆشەویسترین ڕەنگ لەلای پێغەمبەر ﷺ ڕەنگی سەوز بوو )) . وە پۆشاکی خەڵکی بەهەشت هەمووی لەداری طوباوە دەردەچێت ، ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((طوبى شجرة في الجنة مسيرة مئة عام ، ثياب أهل الجنة تخرج من أكمامها* ))[٣٠٧] واتە: (((طوبا) درەختێکی گەورەی بەهەشتە ماوەی سەد ساڵە، هەموو پۆشاکی بەهەشتیەکان لە بەرگی ئەو دارەوە دێتەدەر)). وە پۆشاکی خەڵکی بەهەشت لەناو ناچێت و نارزێت . لەئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((...لايبلى ثيابه ولايفنى شبابه...))[٣٠٨] واتە : (( پۆشاکیان نارزێت و گەنجیشیان لەناو ناچێت ... )). وە لەبەهەشتدا حۆری عەینەکان سەرپۆشیان هەیە ، وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : ((... ولو أن امرأة من أهل الجنة اطلعت الى أهل الارض لآضاءت مابينها ولملأته ريحاً ، ولنصيفها على رأسها خير من الدنيا وما فيها .. ))[٣٠٩] واتە : (( ئەگەر ئافرەتێکی ناو بەهەشت خۆی نیشانی خەڵکی سەرزەوی بدات نێوانی ئاسمان و زەوی ڕووناك دەکاتەوە و ئەو نێوانەش پڕ دەکات لەبونی خۆش و سەرپۆشە کەی سەری چاکترە لە دونیاو لە وەشی کە لە دونیادا هەیە )).

وە لە ڕیوایەتێکی تردا لە ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه دەفەرمووێت : [ قلت : يارسول الله وما النصيف ؟ قال : (( الخمار)) ؟... ][٣١٠] واتە : ووتم ئەی پێغەمبەی خوا : نەصیف؟ چی یە؟ فەرمووی (سەرپۆشە) . وەخەڵکی بەهەشت دەستە سرپان هەیە لە بەرائی کوڕی عازیبەوە رضي الله عنه دەفەرمووێت : ((پۆشاکێکی ئاوریشمیان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا بە دیاری و هاوەڵەکانی دەور و

---

[٣٠٦] اخرجه : البزار في ((المسند)) (٣٢٥١) ، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٠٥٤) .

* اكمام : جمع كُم وهو غلاف التمر التي تغطي زهورها و براعمها .

[٣٠٧] اخرجه : احمد في ((المسند)) (٧١/٣) ، وابويعلى ((المسند)) (١٣٧٤) ، وحسنه الشيخ الالباني في : ((السلسلة الصحيحة)) (١٩٨٥) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٣١٩٨) .

[٣٠٨] اخرجه : مسلم ((الصحيح)) (٥٣٤/٢) .

[٣٠٩] اخرجه: البخاري ((الصحيح)) (٢٧٩٦، ٦٥٦٨)

[٣١٠] أخرجه : احمد ((المسند)) ( ٢/ ٤٨٣ ) ، وقال الشيخ الالباني في ((سلسلة الاحاديث الصحيحة)) ( ١٩٧٨) : اسناده لاباس به .

پشتی سەریان سورِما لە نەرمی ئەو ئاوریشمە بۆ یە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((**تعجبون من هذا؟ لمناديل سعد ابن معاذ في الجنة أحسن من هذا**)) [٣١١] واتە : (( ئایا سەیرتان لە سورِ دەمنێت ؟ دەستە سرِەکانی سەعدی کورِی مەعاز لە بەهەشتدا زۆر لەمە باشترن)) .

وە لە ناو بەهەشتدا جۆرەها جل و بەرگی نایاب هەیە لەوانە:

١- **پۆشاکی سەربەرزی و رێز:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((**ما من مؤمن يعزي أخاه بمصيبة ، الا كساه الله سبحانه من حلل الكرامة يوم القيامة**)) [٣١٢] واتە : (( هەر باوەرِدارێك دڵنەوای برایەکی باوەرِداری بداتەوە لەسەر توش هاتن بە نارِەحتیەك ئەوا خوای گەورە لە پۆشاکەکانی رێزوسەربەزی بەبەردا دەکات لە رِۆژی قیامەتدا )) .

٢- **پۆشاکی باوەرِ:** بۆ ئەو کەسانەیە کە جل و بەرگی نایابیان لە دونیادا نە پۆشیوە و لە تواناشیاندا هەبووە کە بیپۆشن .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت : ((**من ترك اللباس تواضعاً لله وهو يقدر عليه دعاه الله يوم القيامة على رؤوس الخلائق حتى يخيره من أي حلل الايمان شاء يلبسها**)) [٣١٣] واتە : (( هەر کەسێك لەبەر خۆ بەکەم زانینی بۆ خوای گەورە بەرگ و پۆشاکی نایاب نەپۆشێت هەرچەندە لە تواناشیدا بێت بیپۆشێت ئەو کەسە خوای گەورە لە پێش چاوی هەموو دروست کراوانی یەوە لەرِۆژی کۆتایدا بانگی دەکات و سەرپشکی دەکات لەکام جل وبەرگەکانی ئیمان خۆی پێی خۆشە تا لەبەری بکات )) .

وەپۆشاك و جلی بەهەشت پێوەر ناکرێت لەگەڵ جل وپۆشاکەکانی دونیای خەڵکی سەر زەوی، وەك پێغەمبەر ﷺ روونی کردۆتەوە لەگەورەیی ئەو دایك وباوکانەی منداڵەکانیان فێری قورئان کردووە . لەئەبو بورەیدەوە ئەویش لە باوکی یەوە گێرِاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((**... ويكسى والداه حلتين لا يقوم لهما أهل الدنيا ، فيقولان : بم كسينا هذه ؟ فيقال : بأخذ**

---

[٣١١] اخرجه : البخاري ((الصحيح)) (٣٢٤٩).

[٣١٢] اخرجه : ابن ماجة ((السنن)) (١٦٠١) ، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٣٠١)، وفي ((ارواء الغليل)) (٧٦٤) .

[٣١٣] اخرجه : احمد (المسند)) (٤٣٨/٣) ، والترمذي ((السنن)) (٢٤٨١) ، وقال : حديث حسن ، والطبراني ((المعجم الكبير)) (٣٨٦/٢٠) ، والحاكم ((المستدرك)) (١٨٣/٤) وصححه ووافقه الذهبي ،وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٧١٨).

ولـدكما القـران ...))[٣١٤] .واتـە : (( ئـەو دایـك و باوکـە لەقیامـەت دا خـوای گـەورە دوو پۆشاکیان بەبەردا دەکات کە هەموو پۆشاکی خەڵکی دونیا نایانگاتـیّ ، وەئـەو دایـك وباوکـە دەڵێن ئەم پۆشاکەمان بەچی دەست کەوت ؟ پیّیان دەوترێت : لەبەر ئـەوەی کـە منداڵەکـەتان فێری قورئان کرد ...)) .

وە ئـەو موسـوڵمانانەی سەرپێـچی خـوای خۆیـان کـردووە بـەوەی کەلـەدونیادا پۆشـاکی ئاوریـشمیان لەبـەر کـردووە ئـەوا لەبەهەشـت دا لەبـەری ناکـەن وناپۆشـن .ئـەبو زوبێـرﷺ گێڕاویەتـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی : ((مـن لـبس الحريـر في الـدنيا لم يلبـسه في الاخرة))[٣١٥] واتە : (( هەر کەسێك پۆشاکی ئاوریشم لەدونیادا لەبەر بکات لـە ڕۆژی کۆتایـدا لەبەری ناکات)) .لەڕیوایەتێکی تردا : ((من لبس الحرير في الدنيا لم يلبسه في الاخـرة وان دخـل الجنة لبسه أهل الجنة ولم يلبسه هـو )) [٣١٦] واتە : (( هەر کەسێك پۆشاکی ئاوریشم لەبەر بکات لەدونیادا ئەو کەسە لەڕۆژی کۆتایی دا لەبەری ناکات ، گەر بشچێتە بەهەشـتەوە نیـشتەجێیان بەهەشت لەبەری دەکەن بەڵام ئەو لەبەری ناکات)).

## خشڵ وزێڕی ناو بەهەشت

خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە لەناو بەهەشت دا خـشڵ وزێـڕو زیـو ومـرواری هەیـە بـۆ موسوڵمانان وەکـو خـۆی دەفـەرموێت : ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴿٣٣﴾ ﴾( فـاطر: ٣٣) خوای گەورە لە بەهەشت دا بازنگی ئاڵتون و زیـو

---

[٣١٤] اخرجـه : احمـد ((المـسند)) (٥/٣٤٨) ، وابـن ماجـة ((الـسنن)) (٣٧٨١) ، والـدارمي ((الـسنن)) (٢/٤٥٠) ،والحـاكم (١/٥٦٨) وصححه ووافقه الذهبي ، وابن ابي شيبة ((المصنف)) (١٠/٤٩٢) ،وقال الشيخ الالباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٠٤٨) ،و((صحيح الترغيب)) (١٤٣٤) ، وفي ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٥٩) الحديث يحتمل التحسين ، وقـال ذلك ايضاً الشيخ الأرناؤوط في تحقيقه لـ((شرح العقيدة الطحاوية)) (١/٩٤) .

[٣١٥] اخرجه : البخاري ((الصحيح)) (٥٨٣٢) ، ومسلم (٢٠٧٣) ، وابن ماجة (٣٥٨٨) .

[٣١٦] اخرجه : احمـد (٣/٢٣) (١١١٧٩) وقـال محققـه : حـديث صـحيح ، والنـسائي ((الـسنن الكـبرى)) (٩٨٠٧) ، والحـاكم ((المـستدرك)) (٤/١٩١) وصـححه ووافقـه الـذهبي ، وابـن حبـان (٥٤٣٧) ، والطيالـسي (٢٢١٧) ، والبغـوي (٣١٠١) ، والطحاوي ((معاني الآثار )) (٤/٢٤٦) (٣١٠١) ، وقال القرطبي ((التذكرة في أحوال الموتى و الامور الاخـر)) (٢/٣٧٤) : اسناده صحيح .

ومـرواری دەبەخـشێتە بەهەشـتیەکان . وەهـەروەها دەفـەرموێت : ﴿ عَٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴿٢١﴾ ﴾ (الإنسان: ٢١) وە لە عوقبەی کوڕی عامرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ان کنتم تحبون حلية الجنة وحريرها فلا تلبسوها في الدنيا))[٣١٧] واتە : ((گەر ئێوە حەزتان لـە خـشڵ وزێـڕ و زیـو و ئاوریـشمی بەهەشت هەیە لەدونیادا لەبەری مەکەن و مەی پۆشن )). لـە فەرموودەیـەکی تـردا عەبـدڵای کوڕی عەمرﷺ دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (( مَنْ لـبس الـذهب مـن أمـتي فمات و هو يلبسه حرَّمَ اللهُ عليه ذهب الجنة ، ومن لبس الحرير من أمتي فمات و هو يلبسه حـرَّم الله عليه حرير الجنة))[٣١٨]. ((واتە: هەرکەسێك لە ئومەت و شوێن کەوتوانی من ئاڵتون بـەکار بهێنێت تامردن ، ئەو کەسە خوا حەرامی دەکات لەسەر ئاڵتوانی بەهەشـت بـەکاربهێنێت ، وە هەر کەسێك لە ئومەت و شوێن کەوتوانی من ئاورێشم بپۆشێت تامردن ئەو کەسە خوا حەرامی دەکات لەسەری ئاورێشمی بەهەشت بپۆشێت)).

وە بازنگ و گوارە وملوانکەکانی ناو بەهەشت پێوانە ناکرێت لەگـەڵ بـازنگ وئاڵتونـەکانی دونیا ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((لو أن رجلاً من أهل الجنة اطلع فبدا سواره لطمس ضـوء الشمس ، كما تطمس الشمس ضوء النجوم ))[٣١٩] واتە : ((گەر پیاوێکی لە خەڵکی بەهەشـت خۆی نیشان بدات و بازنگەکەی دەربکەوێت ڕووناکی ڕۆژ ناهێڵێـت وەك چـۆن ڕۆژ دەربکـەوێت ڕووناکی ئەستێرەکان ناهێڵێت)) . وە لە ڕیوایەتەکـەی ئـەبو هـورەیرەدا ﷺ گێڕاویەتـەوە کـە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (( لوان أدنى أهل الجنة حليةً عُدلت حليته عليه أهل الـدنيا جميعـاً ، لكان ما يحليه الله به في الاخرة أفضل من حلية أهل الدنيا جميعاً ))[٣٢٠] واتە : (( گەر زێڕ و زیو و خشڵی کەمترین پلەی بەهەشتیەك بەراود بکرێت یەکسان دەبێت لەگـەڵ هـەموو زێـڕ و زیـو و

---

[٣١٧] اخرجه : النسائي (١٥٦/٧) عن عقبة بن عامر ﷺ مرفوعاً .

[٣١٨] أخرجه : أحمد ((المسند)) (٦٥٥٦) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط : إسناده صحيح .

[٣١٩] اخرجه : احمد ((المسند)) (١٦٩/١) (١٤٤٩) وقال محققه الشيخ الارناؤوط : حسن ،والترمذي ((السنن)) (٢٥٣٨) ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٠٦١) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٥٢٥١) .

[٣٢٠] أخرجه : الطبراني ((المعجم الاوسط)) (٣٧٧) باسناد حسن ،كما قال الحافظ العراقي في تخريج ((الاحياء)) (٥٢٢/٤) ، وقال الهيثمي (( المجمع))) (١٨٦٦٨) : فيه ضعيف وقد وثق وبقيه رجال ثقات .

خشلّی دونیا ، وە ئەو زێڕ و زیو و خشلّانەی کە خوا دەیداتێ لە ڕۆژی دوایدا چاکترە لەسەر جەم زێڕو زیو وخشلّی خەلّکانی هەموو دونیا))

وە هەروەها جۆرەکانی تری خشلّی بەهەشت تاجە ڕازێنراوەکانی پیاو و ئافرەتە ، لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**لو اطلعت امرأة من نساء أهل الجنة الى الارض لملآت مابينها ريحاً ، ولآضاءت مابينهـا ، ولتاجهـا علـى رأسـها خـير مـن الـدنيا ومـا فيها**))[٣٢١] واتە: (( ئەگەر ئافرەتێك لە ئافرەتانی خەلّکی بەهەشت خۆی نیشانی خەلّکی سەر زەوی بدات نێوانی زەوی وئاسمان پڕدەکات لە بۆنی خۆش و ڕووناکی دەکاتەوە ، وە ئەو تاجەشی کە لەسەر سەریەتی زۆرچاکترە لە دونیا و لەوەش کە لە دنیادا هەیە )).

وە لە ڕیوایەتەکەی ئەبو سەعیدی خدریەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((... **وانّ عليها ( أي : على الحور العين ) التيجان ، وان أدنى لؤلؤة عليها لتضيئ مابين المشرق والمغرب**)) [٣٢٢] واتە: ((حۆری عەین تاجی لەسەرە و بچوکترین مرواری تاجەکەی سەری نێوانی ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوا ڕووناك دەکاتەوە )).

وە هەروەها تاجی ڕێز دەبەخشرێت بەو کەسانەی کە قورئانیان وەرگرتووە وکاریان پێکردووە وە هەروەها بۆ ئەو دایك وباوکانەی کە کوڕەکانیان فێری قورئان کردوە .وەهەروەها دەبەخشرێت بە شەهیدیش . ئەبو هوڕەیرە ﷺ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**يجئ القران يوم القيامة فيقول : يارب حله ، فيلبس تاج الكرامة ، ثم يقول يارب زده ، فيلبس حلة الكرامة ...** )) [٣٢٣] واتە: (( قورئان لە ڕۆژی قیامەت دا دێت و تکا بۆ خاوەنەکەی دەکات ودەلّێت : ئەی پەروەردگار خشلّ وزێڕو زیوی پێببەخشە ، وەخوای گەورەش تاجی ڕێزی

---

[٣٢١] اخرجه: الطبراني ((المعجم الاوسط)) (٢٩٥) باسناد جيد كما قال الهيثمي ((المعجم الزوائد)) (٤١٨/١٠) .

[٣٢٢] اخرجه : احمد ((المسند)) (٧٥/٣) ، والحاكم ((المستدرك)) (٤٢٦/٢) ، وصححه ووافقه الذهبي، وقال الحافظ العراقي ((تخريج الاحياء)) (٤٢١٥) : رواه ابو يعلى باسناد حسن ، وقال الهيثمي ((مجمع الزوائد)) (٤١٩/١٠) : رواه احمد وابويعلي واسنادهما حسن .

[٣٢٣] اخرجه : الترمذي ((السنن)) (٢٩١٥) وقال : حسن صحيح ، والحاكم ((المستدرك)) (٥٥٢/١) وصححه ووافقه الذهبي ، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (٨٠٣٠) ، وفي ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٣٢٨) (٣٧٨١) ، وقال الشيخ الالباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٠٤٨) ، وفي ((مختصر الطحاوية)) (٥٩) يحتمل التحسين ، وقال ذلك الشيخ الارناؤوط ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٩٤/١) .

لەسەر دەنێت پاشان قورئان دەڵێت: خوای گەورە بۆی زیاد بکە (واتە: زیاتری پێ ببەخشە) خوای گەورەش خشڵ و زێڕ و پۆشاکی ڕێزی پێ دەبەخشێت )) . وە لە بورەیدەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((ان القران يلقى صاحبه يوم القيامة ... فيعطي الملك بيمينه والخلد بشماله ويوضع على رأسه تاج الوقار ... )) [٣٢٤] واتە : (( قورئان لەڕۆژی قیامەتدا دەگات بەخاوەنەکەی ... پاشان مۆڵك دەدرێتە دەستی ڕاستی ومانەوەی هەتاهەتایی دەدرێتە دەستی چەپی وەتاجی بەها و سەنگینی دەکرێتە سەری ... )) .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((للشهيد عند الله ست خصال : ... ويأمن من الفزع الاكبر ، ويوضع على رأسه تاج الوقار ، الياقوتة منها خير من الدنيا وما فيها ...)) [٣٢٥] واتە : ((شەهید شەش شتی بۆ هەیە ... لەڕۆژی ترسناکی هەرە گەورە ئەمین دەبێت وە تاجی بەها و سەنگینی لەسەر دادەنرێت بچوکترین یاقوتی ئەو تاجە چاکترە لە دونیاو ولەوەی لەوەشی کە لەدونیادا هەیە )) .

وە خەڵکی بەهەشت شانەیان بۆ دروست کراوە لەئاڵتون وە لە زیو، لە ئەبو هورەیرە وە ﷺ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((... انيتهم من ذهب ، وأمشاطهم من الذهب والفضة ومجامرهم الالوة)) [٣٢٦] واتە : (( قاپ و کەوچك و پێداویستیەکانیان لە ئاڵتونە و شانەکانیشیان لە ئاڵتون وزیوە وبغوردەکانیان جۆری ( ئەلوە)یە)) .

---

[٣٢٤] اخرجه : احمد ((المسند)) (٣٤٨/٥) ، رقم (٢٢٩٥٠) وقال محققه : اسناده حسن ، وابن ماجة ((السنن)) (٣٧٨١)، وقال الشيخ الالباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٠٤٨) ، وفي ((مختصر الطحاوية)) (٥٩) يحتمل التحسين ، وكذلك قال الشيخ الارناؤوط ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٩٤/١) .

[٣٢٥] اخرجه : احمد ((المسند)) (١٣١/٤) ، والترمذي ((السنن)) (١٦٦٣)، وابن ماجة ((السنن)) (٢٧٩٩)، و ((صحيح الجامع)) (٥١٨٢) ،و ((المشكاة)) (٣٨٣٤) ،وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٣٥٨) ، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢٢٥٧).

[٣٢٦] اخرجه : الترمذي ((السنن)) (٢٥٣٧) ، وقال : حديث صحيح ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٠٦٠) .

# ناو ماڵ وکۆشکەکانی ناو بەهەشت

لە ناو بەهەشت دا ڕاخەر و فەرشی بەرز هەیە و ناو ڕاخەرو فەرشەکەش هەمووی ئاوریشمە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ ﴾ (الواقعة: ٣٤) واتە : بەرز و ئەستورە وە هەروەها دەفەرموێت : ﴿ مُتَّكِئِينَ عَلَىٰ فُرُشٍ بَطَائِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ ۚ وَجَنَى الْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴿٥٤﴾ ﴾(الرحمن:٥٤) ئیبن و مەسعود ﷺ دەفەرموێت : " أخبرتم بالبطائن فكيف بالظهائر "[٣٢٧]واتە: هەواڵی ناوەوەی فەرشەکانتان پێڕاگەیەنراوە کە ئاوریشمە ئەی دەبێت ڕووی دەرەوەی چۆن بێت؟.

لە ناو ژوور و کۆشکەکانی بەهەشتیەکاندا جێی پاڵکەوتنی بەرز هەیە وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴿١٣﴾ ﴾ (الغاشية: ١٣) واتە : قەڵەویرەی بەرزی تێدایە بۆ ئەوەی بە چاوی خۆی هەموو موڵکەکەی ببینێت ، وە هەروەها دەفەرموێت : ﴿ مُتَّكِئِينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ ۖ وَزَوَّجْنَاهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾ ﴾( الطور: ٢٠) واتە: پاڵیان داوەتەوە لەسەر چەند قەڵەویرەیەکی ڕیزکراو ، وەهەروەها دەفەرموێت: ﴿ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِئِينَ عَلَيْهَا مُتَقَابِلِينَ ﴿١٦﴾ ﴾ (الواقعة: ١٥ – ١٦) واتە: پاڵیان داوەتەوە لەسەر چەند قەڵویرەیەکی بەرامبەر بەیەکی ڕازێنراو.وە ناو ژوورەکانیان ڕازاوەتەوە بەفەرش و قەنەفەی جوان وەکوخوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ أُولَٰئِكَ لَهُمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ ۚ نِعْمَ الثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٣١﴾ ﴾ (الكهف: ٣١) .وە پشتی و فەرشی ژوورەکان و کۆشکەکانیان بەڕیز لە هەموولایەکدا ڕاخراوە ، وە لە تەختایی بەهەشتدا ڕاخەری ناوخوری و فەرشی نایاب ڕاخراوەو بڵاوبۆتەوە . خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ ﴿١٦﴾ ﴾( الغاشية: ١٥ – ١٦) .

---

[٣٢٧] اخرجه: الحاكم (٢/٤٧٥) وصححه ووافقه الذهبي ، والبيهقي ((البعث)) (٣٣٩) ،وحسن اسناده المنذري ((الترغيب))(٥٥٢١) ، وحسنه ايضاً الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب))(٣٧٤٦).

# مێرد منداڵ و خزمەت گوزاری کۆشکەکانی بەهەشت

بڕواداران لە ناو بەهەشتدا مێردمنداڵ و خزمەت گوزار خزمەتیان دەکات وقەت پیر نابن و نامرن و هەتا هەتایە دەمێننەوە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾﴾ (لواقعة: ١٧ – ١٨) وە ئەوگەنج ومێردمنداڵانەی ئەوێ وەکو مرواری ساف وپاك وان کە هیچ شتێکیان بەرنەکەوتبێت هەموو سپی وجوانن، خوای گەورەدەفەرموێت : ﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾﴾ ( الطور: ٢٤) .وە ئەو منداڵانە سەرقاڵن بە خزمەت کردن و بەم لاولادا بلاوەبنەوە لەسەر فەرشی ئاوریشم و ئاڵتون دێن و دەچن وەکو مرواری وان ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴿١٩﴾﴾ (الإنسان: ١٩) .

وە ژمارەی ئەو منداڵانە ئەوەندە زۆرن لە ژماردە نایەن ، لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((ان أدنى أهل الجنة درجة لمن يقوم على رأسه عشرة الاف خادم بيد كل واحد صحفتان* واحدة من ذهب والاخرى من فضة )) [٣٢٨] واتە: (( ئەو کەسەی لە نزمترین پلە بەهەشتدایە دە هەزار خزمەت کار لای سەریەوە وەستاوە بۆ خزمەت کردنی و هەریەکێك لەوان دووقاپی بەدەستەوەیە یەکێکیان لە ئاڵتونە و ئەوی تریان لە زیو)).
لەڕیوایەتێکی تردا عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەفەرموێت : ((إن أدنى أهل الجنة منزلة مَن يسعى عليه ألف خادم ، كل خادمٍ على عملٍ ليس عليه صاحبه)) [٣٢٩]. ((واتە: ئەوکەسەی لە نزمترین پلەی بەهەشتدایە هەزار خزمەتکار دێن و دەچن لەخزمەتکردنیدا ، وە هەموو خزمەتکارێك کارێکی تایبەت بەڕێوە دەبات جیاواز لە کاری هاوڕێکانی تری)).

---

* صفحتان : قصعتان .

[٣٢٨] اخرجه :الطبراني ((الأوسط)) (١٢٥٦) باسناد قوي – كما قال ابن الحجر العسقلاني ((فتح الباري)) (٦/٣٢٤) ، وابن المبارك ((الزهد)) (١٥٣) ، وقال الهيثمي ((المجمع)) (١٨٦٧٠) : رجاله ثقات.

[٣٢٩] أخرجه : البيهقي ((البعث)) (٤٢١) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب))(٣٧٠٥).

وه ئەو خزمەتکارانە خوای گەوره دروستی کردوون لە بەهەشتدا بۆ خزمەت کردنی نیشتەجێ بووەکانی ، ئەوانە منداڵانی بێ باوەڕەکانی دونیان کە بە منداڵی مردوون وەکو ئیبن و قەیم (رحمە الله) دەفەرموێت : ((...وه لەوانەیە منداڵی ئەو هاوبەش پەیداکەرانەیان لەگەڵ دابن کە بە منداڵی مردوون وه خوای گەوره گێڕاونی بە خزمەتکارانی ناو بەهەشت ))[٣٣٠] . وه بەڵگەش فەرمودەکەی ئەنەسە ﷺ گێڕاویەتیەوه کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((أطفال المشركين هم خدم أهل الجنة ))[٣٣١] واتە : (( منداڵەکانی هاوبەش پەرستەکان خزمەت کاری خەڵکی بەهەشتن )) .

# بەهەشت دووره لە تاوان کردن و قسەی پووچ

خەڵکی بەهەشت هیلاك و ماندوو نابن لەناو بەهەشتدا ، وەگوێشیان لە قسەی نابەجێ ونادروست نابێت تیایدا ،جگە لەسەلام کردنە و وەڵام دانەوەی و قسەی خۆش نەبێت هیچی تر نابیستن . وەکو خوای گەوره دەفەرموێت : ﴿ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَامًا سَلَامًا ﴿٢٦﴾ ﴾ (الواقعة: ٢٥ - ٢٦) وه هەروەها دەفەرموێت: ﴿ أُولَٰئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا ﴿٧٥﴾ ﴾( الفرقان: ٧٥) وه خەڵکی بەهەشت تەسبیحاتی خوا دەکەن زۆر بەئاسانی بەبێ ئەوەی توشی ناخۆشی وماندوو بوون ببن ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((...يلّهمون الحمد والتسبيح كما يلهمون النفس ))[٣٣٢] واتە: (( خەڵکی بەهەشت تەسبیحاتی خوای گەوره دەکەن وسوپاسی خوا دەکەن وەکو چۆن ئێوه هەناسە دەدەن و هیچ ئەرکێکی تیانی یە بۆ ئێوه ئەوانیش بەو زیکرانە هیچ توشی ناخۆشی وماندوو بوون وناڕەحەتی نابن )) . لە ڕیوایەتەکەی جابرەوه ﷺ گێڕاویەتیەوه کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((يلّهمون

---

[٣٣٠] انظر :((مختصر حادي الارواح)) (ص : ٢٠٣) لابن القيم الجوزية .

[٣٣١] اخرجه : ابن مندة ((المعرفة)) (٢/٢٦١) ، وابو نعيم ((الحلية)) (٦/٣٠٨) ، والطبراني ((الكبير)) (٧/٢٩٥) ، والروياني ((المسند)) رقم : (٨٣٧) ، وصححه الشيخ الالباني لطرقه وشواهده في ((السلسلة الصحيحة)) (١٤٦٨) .

[٣٣٢] اخرجه : مسلم ((الصحيح)) (٢٨٣٥) ، وابوداود ((السنن)) (٤٧٤١)، وابن حبان ((الصحيح)) (٧٤٣٥) وقال محققه : اسناده صحيح على شرط مسلم .

التسبيح و[التكبير] والتحميد كما تلهمون النفس ))[٣٣٣] واتە : (( خـەڵكی بەهەشـت (سـبحان الله ،والحمدالله ،الله اكبر) دەكەن وناسانە بەلايانـەوە وەك هەناسـەدان)) وە ئـەم زيكرانـەی كـە خەڵكی بەهەشت ئەنجامی دەدەن بەيانيان وئێوارانە وەكو لەم فەرموودەيەدا هـاتووە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێت : ((... يسبحون الله بكرة وعشياً ))[٣٣٤] واتـە : (( لـە بـەيانيان و ئێوارانـدا تەسبيحاتی خوا دەكەن )).

وەسڵاوكردنەكەيان ((السلام عليكم))ە و كۆتايی داخوازيەكانيان (الحمد الله رب العالمين) وەكـو خوای گەورە دەفـەرموێت : ﴿ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌۚ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾ (يونس: ١٠) .وە لە ناو بەهەشتدا سـەرماو گـەرما نـی يـە : وەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِۖ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾ ﴾(الإنسان: ١٣) (واتە: نەڕۆژ وگەرميەكەی تيادە بينن وە نە سەرماو سۆڵە).

وە هەروەها لە ناو بەهەشت دا ڕۆژو هەفتە هەيە بەڵگەش فەرموودەكەی ئەبو هـورەيرە ﷺ گێڕاويەتيـەوە كـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموويـەتی: ((تفـتح ابـواب الجنـة يـوم الاثـنين ويـوم الخميس...))[٣٣٥] واتە: ((دەرگاكانی بەهەشت ڕۆژانی دووشەممە و پێنج شەمان دەكرێنەوە)).

وە ڕۆژی هەينی لەبەهەشتدا هەيە و ناودەبرێت بەڕۆژی خەڵات وديـاری زيـادە كـراو ، وەكـو جبريل ﷺ بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو لەبارەی ڕۆژی جومعەوە: ((... هـو سـيد الايـام ونحـن نسميه عندنا يوم المزيد ... ))[٣٣٦] واتە: (( ئەوە ڕۆژی جومعەيە و سەروەری ڕۆژەكانە وە ئێمە ناوی دەبەين بە ڕۆژی زياد كراو...)). وە لە ناو بەهەشت دا بـەيانيان و ئێـواران هەيـە وەكـو خـوای گـەورە دەفــەرموێت : ﴿ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا إِلَّا سَلَٰمًاۖ وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿٦٢﴾ ﴾ (مـريم: ٦٢) واتــە: ڕزق وڕۆزيـان پـێ دەبەخـشرێت لـە بـەيانيان و ئێوارانـدا) وەهـەروەها

---

[٣٣٣] اخرجه : مسلم ((صحيح)) (٢٨٣٣).

[٣٣٤] اخرجه : مسلم ((الصحيح)) (٢٨٣٤)، وابن حبان ((الصحيح)) (٢٨٣٤) .

[٣٣٥] اخرجه : البخاري ((الادب المفرد)) (٤١١) ، وابن حبان ((الصحيح)) (٥٦٦٣) وقال محققه :اسناده صحيح على شرط مسلم ، وصححه الشيخ الألباني ((صحيح الادب المفرد)) (٣١٨) و ((ارواء الغليل)) (٩٤٨) .

[٣٣٦] اخرجه : الشافعي ((المسند)) (٤٢٤)، وعبد الرزاق ((المصنف)) (٣/٢٥٦)، وابو يعلى (٦/٥٨) ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الترغيب والترهيب)) (٦٩٤) ، و(٣٧٦١) ، وحسنه الشيخ مقبل في ((صحيح المسند)) (٨٦).

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت : ((الشهداء على بارق نهر بباب الجنة في قبة خضراء ، يخرج اليهم رزقهم من الجنة بكرةً وعشياً )) [٣٣٧] واتە : (( شەهیدەکان لە قەراغی ڕووبارێکن لای دەرگای بەهەشت لەناو گومەزێکی سەوزدان خواردنیان لەبەهەشتەوە بۆ دەچێت بەیانیان وئێواران )).

گرنگ لێرەدا ئەوەیە چۆن خەڵکی بەهەشت دەزانن کە بەیانیە یاخود ئێوارەیە شەوەیان ڕۆژە لەناو بەهەشت دا ؟ لەسەعیدی کوڕی نسورەوە لەکوڕی ئەبی ماتەمەوە لە ئیبن عەباسەوە ﷺ هاتووە دەربارەی ئەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت :﴿وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿٦٢﴾﴾ (مريم: ٦٢) دەفەرموێت: ئەوانە بەئەندازەی بەیانیان وئێواران خواردنیان بۆ دێت واتا ماوەکەی چەندەبە ئەندازەی ئەوەندە خواردنیان بۆ دەچێت))[٣٣٨].وەئیبن و منزیر لەهەندێ لەسەلەفەوە دەیهێنێت و دەفەرموێت : (لە بەهەشتدا شەو نی یە چونکە ئەوان لە نورێکدان هەتا هەتایە بەلاّم بەیانیان پەردە هەڵدەبڕن وئێوارانیش بەوە دەزانن کە کاتێ نور کز دەبێتەوە پەردەدا ئەدەنەوە) . (وە(حكيم الترمذي ) لە کتێبی (نوادر الاصول) کە زۆرێکی فەرموودەکانی (ضعيف )ن لە وێدا لە حەسەن و ئەبو قەلابەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموون ((ليس هناك (الليل أي :في الجنة) هو ضوء ونور بِرّد الغدو على الرواح والرواح على الغدو))[٣٣٩] واتە : (لە بەهەشتدا تاریکی شەو نیە بەڵکو زیادکردنی نور و ڕووناکیە لە ڕۆژدا و کزکردنیەتی لە ئێوارەدا).

وەهەروەها دەتوانرێت فەرموودەکەی (لقيط) کوڕی عامر ﷺ باس بکرێت کە لە پێغەمبەر ﷺ ودەگێڕێتەوە ودەفەرموێت : ((وتُحبس الشمس والقمر فلايرون منها واحداً )) واتە : ((ڕۆژو مانگ دیار نامێنن بەهەشتیەکان هیچیان نابینن )) (لقيط) فەرمووی : ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەی بەردەمی خۆمان دەبینین ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( مثل بصرك في ساعتك هذه ،

---

[٣٣٧] أخرجه:أحمد ((المسند)) (١/٢٦٦) ، والطبراني ((المجمع الكبير)) (١٠٨٥٢) ، والحاكم ((المستدرك)) (٢/٧٤) ، وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي ، وابن حبان ((الصحيح)) ( ٤٦٥٨ ) ، وقال محققه : اسناده قوي ، والطبري ((التفسير)) ( ٢٣٢٣ ) ، وقال ابن كثير ((تفسير القران العظيم)) ( ٢/ ١٤١ ) : أخرجه الطبري واسناده جيد ، وحسنه الشيخ الارناؤوط ((زاد المعاد)) ( ٣/ ٩٢ ) ، وحسنه ايضاً الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (١٣٧٨)..

[٣٣٨] أنظر((اللوامع الانوار البهية)) (٢/٢٤٩) للعلامة السفار يينى .

[٣٣٩] نقل ذلك الفاسي في ((شرح دلائل الخيرات)) ،انظر : ((الوامع الانوار البهية)) (٢/٢٥٠) .

وذلك مع طلوع الشمس في يوم أشرقته الارض وواجهته الجبال ...))[٣٤٠] .واتە: (ئێستا چاوت چۆن دەبینێت لەبەهەشتیشدا ئاوا چاوت دەبینێت بەلاّم وەك بەرە بەیانی ڕۆژگار دەبێت کەڕۆژ هەڵهاتووە و شاخەکان بەردەمی ڕۆژیان گرتووە .......)].

وە پرسیار کرا لەئیبن و عەباس ﷺ لەبارەی نوری بەهەشتەوە کەچی یە و چۆنە ؟ ((...قلت: فما نورها ؟ قال : (( ما رأيت الساعة التي تكون فيها طلوع الشمس فذلك نورها الاّ أنّه ليس فيها شمس ولازمهرير ))[٣٤١] واتە : ((فەرمووی : ئەو کاتەت بینیوە کە ڕۆژ تیادا هەڵدێت ، نوری بەهەشتیش وەك ئەو ڕووناکیە وایە ، بەلام نەڕۆژ و نەگەرمایی نە سەرماو سۆڵەی تیادایە نیە)) . بەلاّم ئەم ووتەیە سەنەدەکەی (ضعیف)ە وە لەبەر ئەوەی کە لە ناو بەهەشتدا شەونی یە کەواتە خەویش نی یە ،وەك جابر ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەروە ﷺ و دەفەرموێت : (( النوم أخو الموت ولايموت أهل الجنة )) واتە : ( خەوتن برای مردنە وەخەڵکی بەهەشت نامرن)، لە ڕیوایەتێکی تردادەفەرموێت: (( واهل الجنة لاينامون))[٣٤٢] واتە: (نیشتەجێیانی بەهەشتیش ناخەون) ، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : ((النوم اخو الموت ولاينام اهل الجنة))[٣٤٣]. واتە:( نوستن برای مردنە وەخەڵکی بەهەشتیش نانون ).

---

[٣٤٠] اخرجه : احمد ((المسند)) (١٣/٤) رقم (١٦٢٠٦) وقال محققه الارناؤوط :اسناده ضعيف ، واحمد ((السنة)) (١١٢٠) ، وابن ابي عاصم ((السنة)) (٦٣٦) وقال محققه الشيخ الألباني :اسناده ضعيف ، والحاكم ((المستدرك)) (٥٦٠/٤) وصحح اسناده،والطبراني ((الكبير)) (٤٧٧/١٩)، وقال الهيثمي ((المجمع)) (٣٤٠/١٠): رواه عبدالله والطبراني بنحوه واحد طريقي عبدالله اسنادهما متصل ورجالها ثقات ، وضعفه ابن كثير ((البداية)) (٨٢/٥)، وقال الحافظ ((الاصابة)) (٢٩٥/٣) رقم (٧٤٠٨) عن ابي رزين العقيلي و سند الحديث حسن ، وقال ابن القيم : حديث طويل عليه من الجلالة و المهابة ونور النبوة ماينادي على صحته ، انظر: ((صحيح حادي الأرواح)) (ص:٢٢٤).

[٣٤١] أخرجه : ابن أبي الدنيا ((صفة الجنة)) (١٤٤) ، و ابو الشيخ ((العظمة)) (٥٩٩-٦٠١) ، وحسن اسناده المنذري ((الترغيب و الترهيب)) (٥٤٨٢)، وضعفه الشيخ الألباني ((ضعيف الترغيب)) (٢٢٠٠) و الحديث اوردناه للعلم فقط.

[٣٤٢] اخرجه :البزار ((المسند)) (ص:٣٥١٧) ، وابن عدي ((الكامل)) (٣٨٨/١) ،والبيهقي ((شعب الايمان)) (٤٧٤٥) ،وقال الهيثمي ((مجمع الزوائد)) (٤١٥/١٠) ، رواه الطبراني ((الاوسط)) والبزار ورجال البزار رجال الصحيح ، وصححه الشيخ الالباني لطرقة في ((السلسلة الصحيحة)) (١٠٨٧)،واللفظ للبيهقي ٠

[٣٤٣] اخرجه :الطبراني ((الاوسط))(٩٢٣) ، والبزار (٣٥١٦)، وابو نعيم ((صفة الجنة)) (٩٠) ، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٧٤/٣) ٠

# چ شتێك دەبێتە پەشیمانی بۆ خەڵکی بەهەشت ؟

خەڵکی بەهەشت بەردەوام لە ئەو پەڕی خۆشی و کامەرانیدان و بێتاقەت نابن تەنها لەشتێکدا نەبێت ئەویش لەسەر ئەو کاتەنەی کە لە دونیادا بەفیڕۆیان داوە و یادی خوای گەورەیان تێدا نەکردووە. سەبارەت بەم باسە دوو فەرمووده دەهێنینەوە یەکێکیان (صحیح)ە ئەوی تریان (**ضعیف**)ە و کە تەنها بۆ ئاگاداربوون لیّ ی هێناومە.لە موعازی کوڕی جەبەل ﷺ ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەر ﷺ : ((**لیس یتحسر اهل الجنة الا علی ساعة مرّت بهم لم یذكروا الله تعالى فیها** ))[٣٤٤] واتە : (( خەڵکی بەهەشت لەسەر هیچ شتێك بەداخ و پەشیمان نین تەنها بەداخن لەسەر ئەوکاتانەی کەبەسەریاندا تێپەڕیوە لەدونیادا وزیکری خوایان تیادا نەکردووە ))

وە دووەم فەرموودە کە(صحیح)ە و ابو هورێرە ﷺ دەیگێڕێتە و کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**ماقعد قوم مقعداً لم یذكروا الله عزوجل فیه ، ویصلون علی النبي ﷺ الا كان علیهم حسرة یوم القیامة ، وان دخلوا الجنة للثواب**))[٣٤٥] واتە : (( هەر کۆمەڵێك لە هەر کۆڕێکدا دانیشتبن و یادی خوایان تێدا نەکردبێت و سەڵاواتیان لەسەر پێغەمبەر ﷺ نەدابێت ، ئەو دانیشتنەیان دەبێت بەداخ و پەشیمانی بۆیان لەرۆژی کۆتایدا هەرچەندە بکرێنە بەهەشتیشەوە بەکردەوەکانی خۆیان )).

---

[٣٤٤] اخرجه :الطبراني ((المعجم الكبیر)) (٢٠/١٨٢) ، والدیلمي ((مسند الفردوس)) (٥٢٤٤) ، وقال المنذري ((الترغیب والترهیب)) (٣/٢٠٩) ، رواه البیهقي ((شعب الایمان)) (٥١٣) باسنادین احدهما جید ، وقال الهیثمي ((مجمع الزوائد)) (١٠/٧٤) رواه الطبراني ورجاله ثقات ، وحسنه السیوطي ((الجامع الصغیر)) (٧٧٠١) ، وضعفه الشیخ الالباني في ((ضعیف الترغیب)) (٩١٠) .

[٣٤٥] اخرجه :احمد ((المسند)) (٢/٥٧٢) رقم :( ٩٩٦٥) قال محققه الشیخ الاناؤوط: اسناده صحیح علی شرطهما ، واللفظ له ، وابو داود ((السنن)) رقم: (٤٨٥٥) ، والنسائي ((السنن الكبری)) (١٠٢٤٢) ، والحاكم ((المستدرك)) (١/٤٩١) صححه ووافقه الذهبي ، وابن حبان ((الصحیح)) (٥٩٠–٥٩١) وقال محققه اسناده صحیح علی شرط مسلم ، وقال المنذري ((الترغیب والترهیب)) (٢٢٤١): رواه احمد باسناد صحیح ، وصححه الشیخ مقبل ((الصحیح المسند)) رقم: (٤٠١) ،و صححه الشیخ الألباني في (( صحیح الترغیب)) (١٥١٣).

# یاد کردنەوەی ژیانی دونیا لەلایەن خەڵکی بەهەشتەوە

خەڵکی بەهەشت هەندێکیان سەردانی هەندێکیان دەکەن و باسی بیرەوەری و یادی جارانی دونیایان دەکەنەوە و ئەو ڕووداوانەی لە نێوانیاندا ڕووی داوە بەتایبەت ئەو ڕووداوانەی کە لە نێوان خۆیان و گومڕاکاندا لە دونیادا ڕوویداوە، خوای گەورە: دەفەرموێت : ﴿ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَاطَّلَعَ فَرَآهُ فِي سَوَاءِ الْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَاللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ الْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾ ( الصافات: ٥٠-٥٧) .

واته: کاتێ هەندێکیان بە هەندێکیان دەگەن لە بەهەشتدا پرسیار لە یەکتری دەکەن ،و یەکێك لە بەهەشتیەکان دەڵێت من هاوڕێیەکم هەبوو دەیووت ئایا تۆ بەڕاستی دەزانیت ئێمە کە بووین بە خۆڵ جارێکی تر زیندوو بکرێینەوە و لێپێچینەوەی کردەوەکانی خۆمان لەگەڵدا بکرێت ، بانگیان لێ دەکرێت (واته لە ناو بەهەشتدا) ئایا پێتان خۆشە خۆتان چاوتان پێی بکەوێت ؟ ئەنجا ئەوکەسە بە چاوی خۆی هاوەڵەکەی خۆی دەبینێت کە لە ناوەڕاستی دۆزەخدایە و پێی دەڵێت : وەڵاهی وەختەبوو منیش بەریت بەدوای خۆتا بۆ دۆزەخ ، ئەگەر نیعمەتی خوای گەورە نەبوایە بەسەرمەوە من یەکێك دەبوم لە ئامادە بووەکانی پەنای تۆ لە دۆزەخ دا ، هەر مردنەکەی یەکەم جارمان بوو ئیتر ئێمە جارێکی ترنامرین ئەی نەت بینی ئێمە زیندوو بووینەوە و حسابمان لەگەڵ کرا ...

وە هەروەها خوای گەورە لە دیمەنێکی تردا باسی هەندێ لە خەڵکی بەهەشتمان بۆ دەکات کە ڕوو دەکەنە یەکتر و باسی ژیانی دونیایان دەکەن کە چۆن ترساون لە خوای پەروەردگار ، وە دەفەرموێت: ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوا إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾(الطور: ٢٥ — ٢٧)

واته: هەندێکیان ڕوودەکەنە هەندێکیان و دەڵێن ئێمە لە ناو خەڵکی خۆماندا زۆر لە خوای خۆمان دەترساین خوای گەورە بەڕەحم و بەزەی خۆی لەسزای دۆزەخ لای داین و بەبەهەشتی

بەرین شادی کردین وە ئەم باسەش لە فەرموودەی (صحیح )دا نەهاتووە تەنها لەیەك فەموودەی (**ضعیف**)دا نەبێت، وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت کراوە کە دەفەرموێت :

**((اذا دخل أهل الجنةِ الجنةَ [اشتاق الاخوان بعضهم الى بعض] فيجيئ سرير هذا حتى يحاذي سرير هذا فيبكي هذا[حتى يجتمعا] يتحدثان ويبكي هذا فيتحدثان بما كانا فيه في الدنيا فيقول أحدهما لصاحبه : يافلان تدري أي يوم غفر الله لنا [فيقول صاحبه : نعم ] يوم كنا في موضع كذا وكذا فدعونا الله فغفرلنا ))** [٣٤٦] واتە : (( بەهەشتیەکان کە دەچنە ناو بەهەشتەوە ، هەندێکیان شەیدای بەیەك گە یشتنی هەندێکیان دەبن ، ئنجا قەڵەوێرە وکورسیەکانیان لێك نزیك دەبێتەوە و بەیەك دەگەن وقسە دەکەن سەبارەت بەوژیانەی کە لەدونیادا بەسەربیان بردوو ، یەکێکیان بە هاوڕێ کەی تری دەڵێت: فلانە کەس دەزانیت لە چ ڕۆژێکدا خوا لێمان خۆش بوو ؟ ئەوی تریان دەڵێت: بەڵێ ئەوە لەو ڕۆژەدا بوو کەلەفلان شوێن و فلان شوێندا بووین دوعامان کرد و خوا لێمان خۆش بوو )). ئەم فەرموودەیە (**ضعیف**)ە تەنها لەبەر ئاگاداریتان هێناومە.

# هاتنە دی خواستەکانی خەڵکی بەهەشت

خوای گەورە هەموو ئاواتەکانی بەهەشتیەکان دەهێنێتە دی گەرداوا کردنی منداڵ بێت یاخود کشتوکاڵ کردن بێت یاخود شتانی تر....... وەکو خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ ﴾( فصلت: ٣١) ، واتە: ئێمە هاوکار وپشتیوانی ئێوە بووین لە ژیانی دونیا و قیامەتیشدا، وە بۆ ئێوە هەیە لەو بەهەشتدا ئەوەی کە نەفستان پێی خۆشە و ئەوەش کە داوای دەکەن .وە هەروەها دەفەرموێت : ﴿ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ ۖ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ۖ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ ﴾(الزخرف: ٧١).(واتە: لە سەر سینی و کوپی

---

[٣٤٦] اخرجه : ابن ابي الدنيا ((صفة الجنة))(٢٣٩)، البزار ((المسند)) (٣٥٥٣) ورجاله رجال الصحيح غير سعيد بن دينار والربيع بن صبيح وهما ضعيفان وقد وثقا : كما قال الهيثمي ((مجمع الزوائد)) (٤٢١/١٠) عن انس ﷺ مرفوعاً ،وضعفه الشيخ الألباني في (( ضعيف الترغيب)) (٢٢٣٧) ، وأورده الدينوري ((المجالسة))(٢٤٧٣) وقال محققه : اسناده ضعيف واوردناه للعلم فقط.

ئاڵتون جۆرەها خواردن و خواردنەوەی جوان و ڕازاوەو بە تام بۆ و خـۆش بەسـەریاندا دەگێـڕن ولەبەهەشتدا هەموو ئەوشتانە هەیە کەنەفس ئارەزووی لێ یەتی و چاو یش پێ‌ی خۆشە وە ئێوە بەنەمری تیاتدا دەمێننەوە).

وەهەروەها پێغەمبەر ﷺ هەندێك لە و خواستانەی ڕوون کردۆتەوە لەگەڵ چۆنێتی هاتنەدیان. ئەبو سەعیدی خـودری ﷺ گێڕاویەتیـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ((**ان المؤمن اذا اشتهى الولد في الجنة كان حمله ووضعه وشبابه كما يشتهي في ساعة**)) [٣٤٧] واتـە : ((گـەر موسوڵمان حەزی کرد و پێی خۆش بوو منداڵی ببێت لە ناو بەهەشـتدا ئـەوا سـك پڕیەکـەی و دانانەکەی و گەنجی یەکـەی و گـەورە بـوونی وەك خـۆی ئـارەزووی لێ یـەتی لـە یـەك کاتـدا ڕودەدات)).لەوانەیە ئەم خواستە تەنها بۆ ئەو موسوڵمانانە بێت کە لە ژیانی دونیادا منـداڵیان نەبووە خوای گەورە لەیەك کاتدا خواستەکەیان بۆ دەهێنێتەدی .

لە ڕیوایەتێکی تردا لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ دەفەرموێت : ((پێغەمبەری خـوا ﷺ جارێکیـان دانیشتبوو قسەی بۆ هاوەڵەکانی دەکرد و پیاوێکی دەشتەکی لای دانیـشتبوو ، پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی ((**ان رجلاً من أهل الجنة استاذن ربه عزوجل في الزرع فقـال لـه : أولـست فيمـا أشتهيت ؟ فقال : بلى ولكنني احب أن أزرع ، فاسرع وبذر فبادر الطرف نباته واسـتواؤه واستحصاده وتكويره أمثال الجبال، فيقول الله عزوجل : دونك يا ابـن ادم فانـه لايـشبعك شئ**)) .واتە : (( پیاوێك لە خـەڵکی بەهەشـت ئیزنـی لـە خـوای پـەروەردگار وەرگـرت کـە کشتوکاڵ بکات ، خوای گەورە پێی فەرموو : ئایا هەموو ئارە زووەکانت نەهاتەدی! ، ئـەویش دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگار بەڵام حەزدەکەم کشتوکاڵ بکەم ، خوای گەورەش ڕێگەیدا و خێرا کەوتە کشتوکاڵ کردن و کشتوکاڵەکەشی هەر بەتۆوکردن و بەرزبوونەوە و دروێنە و کۆکردنەوەی بەوێنەی شاخە بەرزەکان لە چاو تروکاندێکا ڕویدا خـوای گـەورەش دەفـەرموێت : بگـرە ئـەی ئادەمیزاد هیچ شتێك تێرت ناکات)) ((**فقال الاعرابي : يارسول الله لاتجد هـذا الاّ قرشـياً أو**

---

[٣٤٧] اخرجـه : احمـد ((المـسند)) (٣/٩) ، والترمـذي ((الـسنن)) (٢٥٦٣) ، وابـن ماجـة ((الـسنن)) (٤٣٣٨) ، وابـويعلي ((المسند)) (١٠٥١) ، والدارمي ((السنن)) رقم (٢٨٣٤) (٢/٣٣٧) ، وابن حبان ((الصحيح)) (٧٤٠٤) ، وقال ابـن القـيم ((حادى الارواح)) (ص: ١٦٧) : اسناده على شرط صحيح ، وقال الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (٦٥٢٥) اسناده صحيح ، وفي ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٠٧٧) ، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٥٠٠) .

**أنصارياً فانهم أصحاب زرع ، فاما نحن فلسنا باصحاب زرع ،فضحك رسول الله ﷺ))**[٣٤٨]
واتە : ((ئەعرابیەکە(واتە: دەشتکییەکە) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو خوایە لەوە دەچێ ئەو پیاوەیان قورەیشی بێ یا نصاری چونکە ئەوان خاوەن کشتوکاڵن و ئێمە خاوەن کشتوکاڵنین، پێغەمبەری خواش بەم قسەیەی هاتە پێکەنین ))

خەڵکی بەهەشت کە جووت دەبن لەگەڵ خێزانەکانیان منداڵبوونی تێدا نی یە چونکە پێویستیان پێی نی یە ، وە منداڵبوون تەنها بۆ ئەو کە سانەیە کە خۆیان پێیان خۆشە منداڵیان ببێت وەك لە فەرموودەکەی (لقیط)دا ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((الصالحات للصالحين تلذذون بهن مثل لذاتكم في الدنيا ، ويلذذن بكم غير أن لاتوالد...))**[٣٤٩] ((ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە خێزانمان هەیە لە بەهەشت دا لە چاکەکاران ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئافرەتە چاکەکان بۆ پیاوە چاکەکان چێژیان لێدەبینن بەوێنەی لە زەتەکانی دونیاتان و ئەوانیش چێژتان لێ دەبینن بەلاّم منداڵتان لێ یان نابێت)).

# ئەو بانگەوازانەی کە بەهەشتیەکان دەیبیستن

خەڵکی بەهەشت گوێیان لەجۆرەها بانگەوازی جیاواز دەبێت کە زیاتر خۆشحاڵیان دەکات وە هەموو بانگەوازەکانیش مژدەی خۆشن وەك: بینینی خوای پەروەردگار و دووەمیان نەمانی مردن و پیری و...وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ ۖ وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ ۖ لَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ ۖ وَنُودُوا أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ (الأعراف: ٤٣) .

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((اذا دخل أهل الجنة الجنة ، ينادي مناد : ان لكم ان تصحوا فلا تسقموا أبداً ، وانّ لكم أن تحيوا فلا تموتوا أبداً ، وان لكم أن تشبوا فلا تهرموا أبداً ، وان لكم أن تنعموا فلا تبأسوا أبداً ،**

---

[٣٤٨] اخرجه : البخاري في ((الصحيح)) (٧٥١٩،٢٣٤٨) .

[٣٤٩] اخرجه : احمد في ((المسند)) (١٣/٤) (١٦٢٠٦) وقال محققه : اسناده ضعيف ، واحمد في (كتاب السنة)) (١١٢٠) ، والحاكم في ((المستدرك)) (٥٦٠/٤) وصححه ، وقال الحافظ في ((الاصابة)) (٢٩٥/٣) ، عن ابي رزين العقيلي وسند الحديث حسن .

وذلك قول الله عزوجل ﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ لَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ وَنُودُوا أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ (الأعراف: ٤٣) ))[٣٥٠] واته : (( کاتێ خەڵکی بەهەشت دەچنە ناو بەهەشتەوە ، بانگ دەرێك بانگەواز دەکات و دەڵێت : ئەی خەڵکی بەهەشت ئێوە ئیتر هەمیشە لەش ساغ دەبن و قەت نەخۆش ناکەون وە هەمیشە زیندو دەبن و قەت نامردن وە هەر گەنج دەبن و پیری ڕووتان تێ ناکات وە هەمیشە خۆش گوزەران دەبن وهەرگیز هەژاری بە خۆتانەوە نابینن، وە ئەمە ئەو ئایەتەی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت : (....کاتێك کە بانگیان لێکرا (لە بەهەشتدا) پێیان وترا : ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە پێتان دراوە بەهۆی کار وکردەوەکانتانەوە کە ئەنجامتان دەدا).

وە سوهەیب ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((اذا دخل أهل الجنة الجنة وأهل النار النار ، نادى مناد : يا أهل الجنة ان لكم عند الله موعداً ، فيقولون : ما هو ؟ الم يثقل موازيننا ويبيض وجوهنا ويدخلنا الجنة وينجينا من النار ؟ فيكشف الحجاب فينظرون الى الله ، فو الله ما أعطاهم الله شيئاً هو أحب اليهم من النظر اليه ))[٣٥١] واته : ((کاتێ خەڵکی بەهەشت دەچنە ناو بەهەشتەوە وە خەڵکی دۆزەخ دەچنە ناو دۆزەخەوە، بانگ دەرێك بانگیان لێ دەکات و دەڵێت : ئەی خەڵکی بەهەشت ئێوە بەڵێنێك و کاتێکی دیاری کراوتان هەیە لەگەڵ خوای خۆتان ، ئەوانیش دەڵێن : ئەو بەڵێنە دەبێت چی بێت ؟ ئەوەتا خوای گەورە کێشانەی کارەکانی ئێمەی قورس کرد ؟ وە ڕووی سپی کردین! وە ئێمەی کردە ناو بەهەشتەوە ، و ڕزگاری کردین لە دۆزەخ . ئەنجا پەردە لادەبرێت و تەماشای خوای گەورە دەکەن سوێند بە پەروەردگار خوای گەورە هیچ شتێکی پێنەداون خۆشەویستر بێت لایان لە تەماشاکردن و بینینی خوای گەورە )).

---

[٣٥٠] اخرجه : مسلم ((الصحيح)) (٢١٨٢/٤) ورقم (٢٨٣٧) ، واحمد ((المسند)) (٣١٩/٢) ، والترمذي ((السنن)) (٣٢٤٦) ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٥٨٨).

[٣٥١] اخرجه : مسلم ((الصحيح)) (١٦٣/١) .

لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ان الله عزوجل يقول لآهل الجنة : يا أهل الجنة ، فيقولون : لبيك ربنا و سعديك ، فيقول : هل رضيتم ؟ فيقولون : وما لنا لانرضى وقد أعطيتنا مالم تعط أحداً من خلقك ، فيقول : الا أعطيكم أفضل من ذلك ؟ قالوا : ربنا واي شئ أفضل من ذلك ؟ قال : أحلُ عليكم رضواني فلا أسخط عليكم بعده أبداً )) [٣٥٢]

واتە : (( خوای گەورە بەخەڵکی بەهەشت دەفەرموێت : ئەی خەڵکی بەهەشت ، خەڵکی بەهەشت وەڵامی خوای گەورە دەدەنەوە دەڵێن : بەڵێ خوای گەورە فەرموو ئێمە گوێڕایەڵین ، خوای گەورە پێیان دەفەرموێت : ئایا ئێوە ڕازی بوون ؟ ئەوانیش دەڵێن ، ئەی پەروەردگار بۆچی ڕازی نابین ئەوەی بەخشیوتە بە ئێمە نەت بەخشیوەتە کەسی تر، خوای گەورەش دەفەرموێت : ئایا لەوە باشترتان پێ ببخشم . ئەوانیش دەڵێن : خوای گەورەمان ئایا هیچی تر هەیە لەوە چاکتر بێت . خوای گەورە دەفەرموێت: ڕازی بوونی خۆمتان پێ دەبەخشم و لەدوای ئەوە هەرگیز لێتان توڕەنابم)).

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((... يؤتى بالموت كهيئة كبش أملح فينادي به مناد : يا أهل الجنة فيشرئبون* وينظرون فيقول : هل تعرفون هذا ، فيقولون : نعم هذا الموت وكلهم قدراه فيذبح ، ثم يقول : يا أهل الجنة خلود فلا موت ... )) [٣٥٣].

واتە : ((مردن دەهێنرێت لە وێنەی بەرانێکی شاخداردا و جارچی یەك جاڕ دەدات ئەی خەڵکی بەهەشت ئەوانیش ملیان درێژ دەکەن و سەیر دەکەن ئەنجا دەڵێن: ئایا ئەوە دەناسنەوە؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ ئەوە مردنە و هەموویان بە چاوی خۆیان دەیبینن ئەنجا سەردەبڕێت پاشان دەوترێت: ئەی خەڵکی بەهەشت هەتا هەتایە لە ناو بەهەشتدادەبن و مردن نەما)).

---

[٣٥٢] اخرجه : البخاري ((الصحيح)) (٦٥٤٩،٧٥١٨) ، ومسلم ((الصحيح)) (٢١٧٦/٤) (٢٨٢٩) ، و((رياض الصالحين)) (ص: ٦٤٦) بتحقيق الشيخ الالباني ..

* فيشرئبون : أي يمدون اعناقهم لينظروا .

[٣٥٣] اخرجه : احمد ((المسند)) (٩/٣) ، والبخاري ((الصحيح)) (٤٧٣٠) ، ومسلم ((الصحيح)) (٢٨٤٩).

# قاپ و دەوری و پێداویستیەکانی ناو بەهەشت

قاپ و قاچاخی ناو بەهەشت دووجۆرن ،جۆرێکیان لە ئاڵتونی پاك دروستکراون و جۆرەکەی تریان لە زیون ، لە ئەبو موساوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**جنتان من ذهب انيتهما وحليتهما وما فيهما ، وجنتان من فضة انيتهما وحليتهما وما فيهما** ...))[٣٥٤] واتە : (( دوو بەهەشتیان خشڵ و قاپ و پۆشاکەکانیان و پێداویستیەکانیان لە ئاڵتونە ، وە دوو بەهەشتیان وخشڵ و قاپ و پێداویستی و پۆشاکەکانیان لە زیوە ...)) وە لە بەهەشتدا سینی و قاپ و دەوری لێیە و هەموویان لە ئاڵتون و زیو دروست کراون وەك خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٧١﴾ ﴾ (الزخرف: ٧١) وە هەروەها دەفەرموێت : ﴿ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا ﴿١٥﴾ ﴾( الإنسان: ١٥) وە هەروەها لە ناو بەهەشتدا کوپی زیوی تیایە لە ناوەوەی دەرەوەی دەبینرێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾ ﴾( الإنسان: ١٥ - ١٦) واتە: لە سوراحی و دۆلکەی زیودا شەرابیان بۆ دەگێڕن کە پەرداخەکانی لە زیو و شوشەو کریستاڵی تایبەت دروستکراون ، و هەریەکەی بە ئەندازە و قەبارەی جیا جیا دروستکراون بەگوێرەو ویستی کەسانی ناو بەهەشت ، وە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾ ﴾(الواقعة: ١٧ - ١٨) واتە: خزمەتکارانی ناو بەهەشت ئێسك سوکن وە بەدەوریاندا دێن و خزمەتیان دەکەن وەهەمیشە گەنجن ، وەبەکوپ و دۆلکە و سوراحیەوە دەگەڕێن و لە پەرداخی تایبەتدا جۆرەها شەربەت و شەرابیان پێشکەش دەکەن کە لەسەرچاوەیەکی ڕەوانەوە پڕدەکرێن. ئەم شتانە دەبەن بۆ خەڵکی بەهەشت یەکەم ئەو کوپانەی کەباس کرا دووەمیان ئەو سوراحیانەی کەئەو کوپانەی پێ پڕدەکرێت وەئەو پەرداخانە هەموو ئاڵتونن،وەبەڵگەش خەوەکەی ئافرەتەکەیە کە بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە ﷺ ئەنەس ﷺ دەفەرموێت : (( **كان رسول الله ﷺ يعجبه الرؤيا ، فربما رأى الرجل**

---

[٣٥٤] اخرجه : البخاري ((الصحيح)) (٧٤٤٤) ، ومسلم ((الصحيح)) (٢٩٦).

رؤياً فيسأل عنه اذا لم يكن يعرفه ، فاذا اثني عليه معروفاً ، كان أعجب لرؤياه اليـه ، فأتتـه امرأة فقالت : يارسول الله رأيت كأني أتيت فأخرجت من المدينة فادخلت الجنة فسمعت وجبة* انفتحت ( وفي رواية : انتحت ، وفي رواية أخرى : ارتجت ) لها الجنة فنظرت فاذا فلان بن فلان وفلان بن فلان – فسمّت اثني عشر رجلاً ، كان رسول الله ﷺ قد بعث سرية قبل ذلك ، فجئ بهم عليهم ثياب طلس ( أي مغبّرةً خِلقة ) تشخب* أوداجهم* ، فقيل : اذهبوا بهم الى نهر البيذخ فغمسوا فيه ، فخرجوا ووجوههم كالقمر ليلة البدر ، فأتوا بصحفة* من ذهب فيها بسر* فاكلوا من ذلك البسر ماشاءوا ، فما يقبلونها من وجه الا اكلوا من الفاكهة ما أرادوا واكلت معهم . فجاء البشير من تلك السرية فقال : أصيب فلان وفلان حتى عد اثني عشر رجلاً ، فدعا رسول الله ﷺ المرأة فقال: [ قُصّي رؤياك ، فقصتها وجعلت تقول : جئ بفلان وفلان كما قال])) [٣٥٥].

واته: ((پێغەمبەر ﷺ زۆر خۆشحاڵ دەبوو بەخەو هەركەسێك خەوێكی ببینیایە ، پێغەمبەر ﷺ گەر ئەو كەسەی نەناسیایە پرسیاری دەكرد خاوەنی ئەو خەوە كێ یە؟ ئەو پیاوە چۆنە ؟ گەر بیان وتایە ئەوەی ئەو خەوەی بینیوە پیاوێكی چاكە و ستایشیان بكردایە ، پێغەمبەر زیاتر خۆشحاڵتر دەبوو بە خەوەكەی دەفەرموێت : جارێكیان ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەومدا بینیم بەدوامدا هاتن و منیان دەركرد لەشاری مەدینە و منیان كردە ناو بەهەشت و گوێم لە زرمە و دەنگێكەوە بوو بەهەشتی پێ لەرزا تەماشام كرد فلاَنی كوڕی فلاَن كەس و فلاَنی كوڕی فلاَن (ناوی دوانزە پیاوی هێنا لەوانەی

* وجبة : صوت سقوط الشئ .
* تشخب : تسيل .
* اوداجهم : شرايين اعناقهم .
* بصحفة : القصعة الكبيرة التي يشبع خمسة رجال .
* بسر : التمر قبل ان يرطب .

[٣٥٥] اخرجه : احمد ((المسند)) (٣/١٣٥) رقم (١٣٦٩٨) وقال :محققه الشيخ الارناؤوط : اسناده صحيح على شرط مسلم ، وابويعلى ((المسند)) (٣٢٨٩) وقال : محققه اسناده صحيح ، وابن حبان ((الصحيح)) (٦٠٥٤) وقال محققه اسناده قوى على شرط مسلم ، والبيهقي ((الدلائل)) (٧/٢٦) ، وقال ابن القيم ((حادى الارواح)) (ص:٣١٠) : اسناده على شرط مسلم ، وقال الهيثمي ((مجمع االزوائد)) (٧/١٧٥) : رواه احمد ورجاله رجال الصحيح وقال الشيخ مقبل في ((الصحيح المسند)) رقم : (٥١) هذا حديث صحيح .

شاری مەدینە کە خۆی ئەوانی دەناسی ) ئەنەس ﷺ دەفەرمویت : پێغەمبەر ﷺ پێشتر مەفرەزەیەکی نارد بوو بۆ غەزا ، ئافرەتەکە ووتی : هەموویان هێنان و جلێکی کۆنی تۆ زاوییان لەبەردا بوو خوێن لە دەمارەکانیان دەڕۆیشت پێیان ووتن : بیان بەن بۆ ڕووباری بە یزەخ و لە ئاوەکەیان هەڵکێشان و نوقمیان کردن ، پاشان هاتنە دەرەوە ڕویان وەکو مانگی شەوی چواردە دەگەشایەوە ،وە هەر یەکەیان لە قاپێکی ئاڵتوندا خورمایەکیان بۆ هێنان (کەهێشتا نەگەیبوون) ئەوانیش لەو خورما نەگەیوەیان خوارد تاویستیان لێی بوو وە لەهەر لایەکی سینیەکەدا چەندین جۆر میوەیان دەخوارد بە ئارەزووی خۆیان وەمنیش لەگەڵم خواردن. پاشان یەکێك لەو مەفرەزەیە گەڕایەوەو ووتی : فلأن کەس و فلأن کەس پێکران (واتە: باسی شەهیدکانی کرد) تاوەکو دوانزە پیاوی ژمارد ،پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوئافرەتەی بانگ کردو پێی فەرموو : ((خەوەکەت بگێڕەوە؟ ئەویش خەوەکەی گێڕایەوە ،ووتی فلأن کەس و فلأن کەسیان هێنا وەکو چۆن پیاوەکە گێڕایەوە و ناوی دوانزدە شەهیدە کەی هێنا)).

## بینینی دۆزەخیەکان و جێگەکانیان

بەهەشتیەکان هەرکەسێکیان بوویت لە دۆزەخیەکان دەیبینن و پێیان پێدەکەنن ، وەکو خوای گەورە دەفەرمویت : ﴿ فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ ﴿٣٤﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ (المطففين: ٣٤ – ٣٥) وە خوای گەورە بەسەرهاتی : بانگ کردنی کەسانی ناو بەهەشت بۆ کەسانی ناو دۆزەخ ، و بانگ کردنی خەڵکی دۆزوخ بۆ خەڵکی بەهەشتمان بۆ باس دەکات و دەفەرمویت : ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ أَصْحَـٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا ۖ قَالُوا۟ نَعَمْ ۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌۢ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾( الأعراف: ٤٤). واتە: خەڵکی بەهەشت بانگ لە خەڵکی دۆزەخ دەکەن وپێیان دەڵێن : ئێمە ئەوەمان دەست کەوت و بینیمانەوە کەخوای گەورە بەڵێنی پێدابووین ئایا ئێوەهیچتان بینی لەوەی کەخوا بەڵێنی پێدابوون ، ئەوانیش دەڵێن : بەڵێ .بانگەوازکارێك لە نێوانیاندا بانگەواز دەکات دەڵێت لەعنەتی خوا لەو ستەم کارانە بێت کەپشت لە بانگەوازی خوا دەکەن و خەڵکانی لێ دوور دەخەنەوە و ناشیرینی دەکەن لە پێش چاویان و باوەڕیان بە ڕۆژی کۆتای نیە.

وەهەروەها خەڵکی بەهەشت جێگەی خۆیان لەناو ئاگردا پێنیشان دەدرێت بۆ ئەوەی زیاتر سوپاسی خودا بکەن کە ڕزگاری کردون لەو شوێنە ...ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**لایدخل احد الجنة الا أري مقعده من النار لو اساء ليزداد شكراً ، ولا يدخل النار أحد الا أري مقعده من الجنة لو أحسن ليكون عليه حسرة** ))[٣٥٦]
واتە : ((هیچ کەس ناچێتە بەهەشتەوە تاوەکو جێگەی خۆی پێنیشان نەدرێت لەناو دۆزەخ گەر خراپ کاربوایە ، بۆ ئەوەی زیاتر سوپاسی خوا بکات ، وەهیچ کەسیش ناچێتە ناو ئاگرەوە هەتا وەکو جێی خۆی پێنیشان نەدرێت لەناو بەهەشت گەر چاکەکاربووایە ، بۆ ئەوەی ببێتە داخ و نارەحەتی بۆی )).

وەلەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((**كل أهل النار يرى مقعده من الجنة فيقول : لو أن الله هداني فتكون عليه حسرة ، وكل أهل الجنة يرى مقعده من النار فيقول: لولا أنّ الله هداني ، فيكون له شكر ، ثم تلا رسول الله ﷺ** : ﴿ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴾))[٣٥٧] واتە: (( هەموو دۆزەخیەك جێگەی خۆی پێنیشان دەدرێت لەناو بەهەشتداو و دەڵێت: ئەگەر من خوای گەورە ڕێنموی بکردمایە ئەوە جێگەم دەبوو ئەو دیمەنەش دەبێتە داخ و پەشیمانی بۆی . وەهەموو بەهەشتیەکیش جێگەی خۆی پێنیشان دەدرێت لەناو ئاگردا و دەڵێت: گەر خوای گەورە ڕێنمونی نەکردمایە ئەوەجێگم دەبوو، ئەو دیمەنەش دەبێتە ئەوەی زیاتر سوپاسی خوابکات پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە :

﴿ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴾ (الزمر: ٥٦) واتە: نەوەکو یەکێك بڵێت: ئاخ وداخ و پەشیمانی بۆ ئەو هەموو لادانە لە فرمانی خواو بەرنامەکەی بێ گومان لەو کەسانەش بووم کە گاڵتەم بە ئاین وبەرنامە خوادەکرد.

---

[٣٥٦] اخرجه : البخاري ((الصحيح)) (٦٥٦٩) ، واحمد ((المسند)) (٢/٥٤١) ، وابن ماجة ((السنن)) (٤٢٦٨)، وابن حبان ((الصحيح)) (٧٤٥١).

[٣٥٧] اخرجه : الحاكم ((المستدرك)) (٢/٤٣٥) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي ، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٠٣٤).

# بینینی خوای پەروەردگار لەبەهەشتدا

خەڵکی بەهەشت خوای بەرزو شکۆمەند دەبینن بەچاوی خۆیان ،وەکوخوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾(القيامة: ٢٢ - ٢٣) وە پێغەمبەری خواش ﷺ چۆنیەتی بینینی خوای گەورەی ڕون کردۆتەوە کە باوەڕداران چۆن خوای گەورە دەبینن لە ناو بەهەشتدا :- سوهەیب ﷺ دەفەرمویێت :

((پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ ۚ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾( یونس: ٢٦) وەفەرمووی : ((اذا دخل أهل الجنة الجنة ، وأهل النار النار ، نادى مناد : يا أهل الجنة ، ان لكم عند الله موعداً يحب ((في رواية : يريد) ان ينجزكموه ((في رواية مسلم : يقول الله تعالى : تريدون شيئاً أزيدكم)) فيقولون : وما هو ؟ الم يثقل الله موازيننا ويبيض وجوهنا ، ويدخلنا الجنة ، ويجرنا من النار ؟ قال : فيكشف الحجاب ، فينظرون اليه فو الله ما أعطاهم الله شيئاً احب اليهم ((ولا أقر لآعينهم )) من النظر اليه)) ))[٣٥٨] واتە : (( کاتێ خەڵکی بەهەشت چونە ناو بەهەشت و خەڵکی ئاگر چونە ناو ئاگر ، بانگ کارێك بانگ دەکات و دەڵێت : ئەی خەڵکی بەهەشت لای خوای گەورە بەڵێنێك و بەیەك گەیشتنێکتان هەیە خوای گەورە پێی خۆشە (لە ڕیوایەتێکدا ((ویستی هەیە )) بۆتانی بهێنێتە دی ((لەڕیوایەتەکەی مسلم دا: خوای گەورە دەفەرمویێت : پێتان خۆشە شتێکی زیاترتان پێ ببەخشم)) ئەوانیش دەڵێن ئەو بەڵێن و شتە زیادە دەبێت چی بێت ؟ ئەوەتا خوای گەورە کێشانەی کارەکانی ئێمەی قورس کرد؟ وە ڕووی سپی کردین و ئێمەی کردە ناو بەهەشتەوە؟ و ڕزگاری کردین لە دۆزەخ . ئەنجا پەردە لادەبرێت و تەماشای خوای گەورە دەکەن ، سوێند بە خوای گەورە پەروەردگار هیچ شتێکی پێ نەداون خۆشەویست تر بێت لایان و دڵخۆش تر بێت بۆیان لە بینین و تەماشاکردنی خوای گەورە )).

وەخەڵکی بەهەشت بەبینینی خوای پەروەردگار هیچ زیانێکیان پێناگات ، ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ان الله لاینام ... حجابه نور

[٣٥٨] اخرجه : احمد في ((المسند)) (٤/٤٠٧) ، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٧٥٥).

لوكشفه لأحرقت سبحات وجهه ما أنتهى اليه بصره من خلفه )) [٣٥٩] واتە: (( خوای گەورە نانوێت ونوستن بۆ ئەونیە لە نێوان خوای گەورە و دروستکراوەکانی پەردەی نور هەیە گەر لایببات گەورەیی و نوری ڕوخساری هەموو ئەوانە دەسوتێنێت کە ئەو نورە دەیانگاتێ)).

وە هاوەڵە بەڕێزەکان پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد ﷺ ئایا بەبینینی خوای خۆیان زیانیان پێدەگات ، وەك ئەبو هورەیرە ﷺ فەرموویەتی: ((کەسانێك بە پێغەمبەریان ﷺ فەرموو : ئایا خوای خۆمان دەبینین لە ڕۆژی قیامەتدا ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : ((هل تضارون في رؤية القمر ليلة البدر ؟ )) واتە: (( ئایا کاتێ کەمانگ بەئاسمانەوە دەبینن لەشەوی چواردە دا هیچ زیانێکتان پێدەگات بەبینینی ؟ )) ووتیان نەخێر ، پاشان فەرمووی: ((کاتێ کە ڕۆژ دەبینین لە ئاسماندا و هەوری لەپێش نەبێت هیچ زیانێکتان توش دەبێت ؟ )) ووتیان : نەخێر ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : ((ئێوەش ئاوا خوای خۆتان دەبینن و [... بە هیچ جۆرێك زیانتان توش نابێت][٣٦٠] ))[٣٦١]وە خەڵکی بەهەشت سەردانی خوای خۆیان دەکەن و قسەشی لەگەڵ دەکەن و پرسیاریشی لێدەکەن : ئەنەس ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((جاءني جبريل وفي كفه مرأة بيضاء فيها نكتة سوداء ...قلت : ما هذه النكتة السوداء ، قال هذه الساعة [تقوم يوم القيامة] يوم تقوم فيها القيامة وهو [عندنا] سيد الايام ونحن نسميه عندنا [في الأخرة]يوم المزيد ، قلت : ولم تسمونه يوم المزيد ياجبريل ، قال : ان ربك اتخذ في ((الفردوس)) وادياً أفيح (وجعل فيه كثباناً من المسك الابيض ، فاذا كان يوم الجمعة من أيام الاخرة ((أنزل الله تبارك وتعالى ماشاء من ملائكته)) وهبط الجبار جل وعلا من عرشه [من عليين] الى كرسيه الى ذلك الوادي [(وثم صف الكرسي بمنابر) من نور عليها مقاعد النبيين ، وحف تلك المنابر [ بكراسي] من ذهب مكللة بالياقوت والزبرجد ، عليها الشهداء والصديقون ، فجلسوا من ورائهم على تلك الكثب] [ثم يجيء أهل الجنة حتى يجلسوا على الكثيب] ثم يتبدّى لهم ذو الجلال والاكرام [ حتى ينظروا الى وجهه عزوجل))

---

[٣٥٩] اخرجه : مسلم ((الصحيح)) (١٧٩) ، وابن ماجة ((السنن)) (١٩٥) ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٦١)، وحول المعنى:انظر : ((النهاية)) (٣٣٢/٢).

[٣٦٠] أخرجه: البخاري ((الصحيح)) (٥٥٤).

[٣٦١] اخرجه : البخاري ((الصحيح)) (٧٤٣٧) ، ومسلم ((الصحيح)) (١٨٢).

فيقول : أنا الذي صدقتكم وعدي وأتممتُ عليكم نعمتي واحللتكم دار كرامتي فسلوني [أعطيكم] فيقولون بأجمعهم : نسألك الرضى عنكم ، فيشهدهم [أنّه قد رضي عنهم] [و(يقول) :..ولكم عليّ ماتمنيتم ولدي مزيد ثم يقول سلوني ، فيسألونه حتى تنتهي نهمة كل عبدٍ منُهم – وفي رواية – [ ثم يقول الله : اكسوا عبادي . فيكسَون ، ويقول : أطعموا عبادي . فيطعمون ، و يقول: اسقوا عبادي . فيسقون ، ويقول : طيّبوا عبادي . فيطيبون)) ثم يقول : سلوني ، فيقولون : حسبنا ربنا رضينا ، فيرجع الجبار الى عرشه [ ثم يصعد الرَّب تبارك وتعالى على كرسيه ، فيصعد معه [ النبيّون والصدّيقون و الشهداء ] فيفتح لهم بعد انصرافهم من يوم الجمعة مالا عين رأت ولا أذن سمعت ولاخطر على قلب بشر ،[ الى منصرف الناس يوم الجمعة] فيرجع أهل الغرف الى غرفهم [ فهم يحبون يوم الجمعة لما يعطيهم ربهم من الخير ، [في رواية: فليسوا الى شيءٍ احوج منهم الى يوم الجمعة ليزدادوا فيه كرامة ، و ليزدادوا فيه نظراً الى وجه تبارك وتعالى ولذلك دعي يوم المزيد] وهو اليوم الذي استوى فيه ربكم على العرش ، وفيه خلق آدم عليه الصلاة والسلام وفيه تقوم الساعة)) [٣٦٢] واته: (( پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : جبریل هات بۆلام و ئاوێنەیەکی بەدەستەوە بوو خاڵێکی ڕەشی تیابوو پاشان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: لێم پرسی ئەو خاڵە ڕەشە چی یە ؟ فەرمووی ئەوە ڕۆژی جومعەیە کە قیامەت تیایدا هەڵدەسێت و سەروەری ڕۆژەکانە ئێمە لای خۆمان ناوی دەبەین بە ڕۆژی زیادکراو ، منیش ووتم: بۆ چی وای پێ دەڵێن ؟ ئەویش فەرمووی:

---

[٣٦٢] اخرجه : ابن ابي شيبة ((المصنف)) (٥٥١٦) ، الشافعي (رحمه الله ) ((المسند)) (٤٢٤) ، وابويعلى ((المسند)) (١٠٤٦/٣) رقم (٤٢٨٨) ، وعبدالرزاق ((المصف)) (٢٥٦/٣) ، والطبراني ((المعجم الاوسط)) (٤٨/١) ، والطبراني ((الاحاديث الطوال)) رقم (٣٥) ، وابن ابي الدنيا ((صفة الجنة)) (٣٣٠)، وابو نعيم ((الحلية)) (٧٢/٣) ، والبزار ((المسند)) (٣٥١٩) ، وعبدالله بن احمد بن حنبل ((كتاب السنة)) (٤٦٠) وقال محققه رواه الطبراني ((الاوسط)) باسناد جيد ، وابويعلى ((المسند)) باسناد جيد ، وقال الهيثمي ((المجمع الزوائد)) (١٦٤/٢) رواه الطبراني ((الاوسط)) ورجاله ثقات وقال ابن كثير ((نهاية البداية)) (٣٩٥/٢) رواه الشافعي والبزار وابويعلي وهذه طرق جيد وقال الحافظ الضياء : وقد روى من طريق جيد عن انس ﷺ ، وقال المنذري ((الترغيب الترهيب)) (٢٧٤/٤) رواه ابن ابي الدنيا ، والطبراني ((الاوسط)) (باسنادين احدهما جيد قوى وابويعلي مختصرا ورواته رواة الصحيح والبزار ،وحسنه الشيخ الالباني لمجموع طرقة في ((صحيح الترغيب والترهيب)) (٦٩٤) ، وفي ((السلسة الصحيحة)) (١٩٣٣) مختصرا و ((صحيح الترغيب)) (٣٧٦١) مطولاً، وقال الشيخ مقبل ((الصحيح المسند)) (رقم :٨٦) هذا حديث حسن مطولا ، وقال البوصيري ((اتحاف الخيرة المهرة)) (٢١٢١) : رواه الطبراني بسند جيّد ، ورواه ابو يعلى بسند صحيح

خوای پەروەردگار جێگە و دۆڵێکی دابین کردووە لـە میسکی پـاکی سـپی لـە فـیردەوس دا ، هەرکاتێ رۆژی جومعە دێت لە رۆژانی کۆتایدا ((خـوای گـەورە ئـەوەی بیـەوێت لـە مەلائکـە دادەبەزێنێتە ئەوێ)) ئنجا خوای گەورە لە عەرشی خۆیەوە لە (علیین) دەچێتە سەر کورسی لـە وێشەوە بۆ ئەو دۆڵە و (چەندها مینبەر لە چواردەوری (الکرسي) دادەنرێت لەم لاو لایـەوە کـە جێگەی دانیشتنی پێغەمبەرە بەرێزە کانە ، لـە چـواردەوری کورسـی پێغەمبـەرانیش چـەندها کورسی ئاڵتون کە رازێنراوەتەوە بەیاقوت و زەبەرجەد، دابین دەکرێت و شەهیدان و پیاوچاکان و راستگۆیانی لەسەر دادەنرێت ، ئەفەرموێت : ئەوانیش لـە دوای ئـەوان دادەنیـشن)) و پاشـان هەموو بەهەشتیەکان دێن و لە دوای ئەوانـەوە لەسـەر تەپۆڵکـەکان دادەنیـشن پاشـان خـوای پەروەردگار خۆی نیشانیان دەدات تاکو ((سەیری روخساری دەکـەن)) خـوای گـەورە بەخـەڵکی بەهەشت دەفەرموێت : منم کە پەیمانەکەی خۆم راست بۆ هێنانە دی وە نیعمەتی تەواوی خۆمم پێبەخـشین و ئێـوەم بـە بەهەشـتی شـوێنی رێـزی خـۆم شـاد کـرد داوام لـێ بکـەن تـا پێتـا بەخشم...ئەوانیش هەموو دەڵێن : داوات لێ دەکەین کە لێمان رازی بیت ئـەی پـەروەردگار ، خوای گەورەش دەفەرموێت : (رازی بوونم بوو ئێوەی گەیاندە جێگەی پڕ رێز و بەخشینم ، ئـەوا لەهەر هەمووتان رازی بووم) ئەنجا خۆشیان بەشاهید دەگرێت کە هەموویان خـوای پـەروەردگار لێیان رازی یە ، ئنجا دەفەرموێت ((...هەرچی یەك ئەمرۆ پێتان خـۆش بێـت لـەوە زیـاتریش پێتان دەبەخشم )) پاشان دەفەرموێت : داوام لێ بکەن ! ئەنجا هەمـوو داوا دەکەن تـا داواکـاری هەر یەکێکیان تەواو دەبێت ، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت : بەندەکانم پۆشتە بکەن ! پۆشتە دەکرێن ، پاشان دەفـەرموێت : خـواردن بـدەن بـە بەنـدەکانم ! خواردنیـان دەدرێتـێ ، پاشـان دەفەرموێت : خواردنەوە بدەن بـە بەنـدەکانم ! خواردنـەوەیان دەدرێتـێ ، پاشـان دەفـەرموێت: بەندەکانم بۆن خۆش بکەن! بۆن خۆش دەکرێن ، پاشان دەفەرموێت : داوام لێ بکەن ؟ ئـەوانیش دەڵێن: ئەوەندەمان بەسە ئەی پەروەردگار رازین، پاشان خوای پەروەردگار بـەرز دەبێتـەوە بـۆ سەر عەرشی خۆی پاشـان دەچـێتە سـەر (الکرسي)ی خـۆی [و پاشـان لەگەڵـدا پێغەمبـەران وراستگۆیان و شەهیدەکان بەرز دەبنەوە و هەموو بەهەشتیەکان دەگەرێنەوە بۆ جێگەی خۆیان ] پاشان شتانێکیان پێدەبەخشرێت کە نەچاو بینیویـەتی و نـە گـوێ بیـستویەتی وە نەبەخـەیاڵی کەسیش دا هاتووە ئەوانەیان پێدەبەخشرێت هەتا ماوەی بلاّوەکردنی خەڵکان لـە رۆژی هـەینی

دا، پاشان نیشتە جێ بووانی کۆشکەکانیش هەموو دەگەڕێنەوە بۆ جێگەی خۆیان ، پاشان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (ئەوان بۆیە ڕۆژی جومعەیان پێخۆشە لەبەر ئەو خەلاّتانەی کەلەلایەن خوای خۆیانەوە پێیان دەبەخشرێت ئەوە ئەو ڕۆژەیە کەخوای خۆتان تیایدا چۆتە سەر عەرش ، وەئادەمیشی تیایدا دروست کردووە قیامەتیش تیایدا بەرپا دەبێت [ بەهەشتیەکانیش زۆر پێویستیان بە ڕۆژی هەینی هەیە بۆ ئەوەی خەلاّتیان زیاتر پێ ببەخشرێت وە زیاتر شادبن بە تەماشاکردن و بینینی خوای گەورە ، وە لەبەر ئەوەشە ناونراوە : ڕۆژی خەلاّت و دیاری] ))
وەخوای گەورە لەگەڵ خەڵکی ئەعراف داگفتو گۆ دەکات وە دەیانکاتە ناو بەهەشت وەکو حوزەیفە ﷺ دەفەرموێت: ((**أصحاب الاعراف قوم تجاوزت حسناتهم النار ، وقصرت سيئاتهم عن الجنة ، فاذا صرفت أبصارهم تلقاء أصحاب النار قالوا : ربنا لاتجعلنا مع القوم الظالمين فبيناهم كذلك ، اذ اطلع عليهم ربك فقال لهم : قوموا ادخلوا الجنة قد غفرت لكم**)) [٣٦٣] واتە : (( خەڵکی ئەعراف کەسانێکن چاکەکەیان کەم بووە و پێی نەچونەتە بەهەشت وەخراپەکانیشیان کەم بووە و پێی نەچونەتە ناو دۆزەخ ، کە ئاوڕدەدەنەوە لەئاگری دۆزەخ دەڵێن : پەروەردگار لەدۆزەخ بمان پارێزێت و لەگەڵ خەڵکی دۆزوخ دا کۆمان نەکەیتەوە ئەوان لەو حاڵەدان تا خوای پەروەردگار تەماشایان دەکات و : پێیان دەفەرموێت : هەستن بچنە بەهەشت ئەوا لە ئێوەخۆش بووم )).

# شاخەکانی ناو بەهەشت

لەناو بەهەشتدا گردوو تەپۆڵکەی میسك هەیە وەکو لە فەرموودەکانی تردا باس کران ، وە هەروەها شاخیش هەیە ، ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**أولاد المؤمنين في جبل في الجنة يكفلهم ابراهيم وسارة حتي يردهم الى ابائهم يوم القيامة** )) [٣٦٤] واتە: (( کۆرپەی مردووی موسوڵمانان لەشاخێکن لەناو بەهەشتدا ئیبراهیم و

---

[٣٦٣] اخرجه : الحاكم ((المستدرك)) (٣٢٠/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي ، وقال السيوطي ((الدر المنثور)) (١٦٢/٢) : وهو حسن .

[٣٦٤] اخرجه : احمد ((المسند)) (٣٢٦/٢) ، والحاكم ((المستدرك)) (٣٨٤/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (١٠٢٣) .

سارا چاودێرییان دەکەن تاوەکو دەیسپێرنەوە بەخاوەنـەکانیان لـە ڕۆژی قیامەتـدا (واتـە: دوای چونە بەهەشتیان ) )) . هەروەها دەفەرمویّت : ((منبري على تُرعةٌ* من تـرع الجنـة))[٣٦٥] واتە: (( مـنیبەرەکەی مـن لەبەرزایی یەکە لە بەرزایەکانی بەهەشت )).

## پلەو پایەی شەهیدەکان لەناو بەهەشتدا

شەهیدەکان پلەوپایەی تایبەتی خۆیان هەیە لەڕۆژی قیامەتدا. ئەوان لـە سـەرەتای ئەوانـەن کەدەچنە ناو بەهەشتەوە بەتایبەتی شەهیدە هەژارە کۆچکارەکان ،وەکۆشـکی تایبـەتیان هەیـە بەناوی خانەی شەهیدەکان وەپێغەمبـەری ئـازیز ﷺ بەچـاوی خـۆی لەخـەوی دا بینیویـەتی ، لەسەمورەی کوڕی جوندب ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ((رأيـت الليلـة رجلين ، أتياني، فاخذا بيدّي .........فانطلقا فاتينا على روضة فيها من كل نور الربيع* ، واذا بين ظهراني الروضة رجـل طويـل لا أكـاد أرى رأسـه طـولاً في الـسماء ، واذا حـول الرجل من أكثر ولدان رأيتهم قط [ فانطلقنا حتى انتهينا الى روضـة خـضراء [ عظيمـة ] فيها شجرة عظيمة وفي أصلها شيخ وصبيان .... فصعدا بي في الشجرة وادخلاني داراً لم أر قط أحسن منها فيها رجال شيوخ وشبان ونساء وصبيان، ثم أخرجـاني منهـا فـصعدا بـي االشجرة فادخلاني داراً هي أحـسن وأفـضل فيهـا شـيوخ وشـباب ] في روايـة : فانطلقنـا فانتهينا الى روضة عظيمة لم أر روضة قط اعظم منها ولا أحسن قال : قالا لي : أرقه فيهـا ، قال : فارتقينا فيها فانتهينا الى مدينة مبنية بلبن ذهب ولبن فضة فاتينا باب المدينة فاسـتفتحنا ففتح لنا فدخلناها .... قالا لي هذه جنة عدن هذاك منـزلك قال فسما بصري صعداً فـاءذا قصر مثل الربابة البيضاء* قال : قالا لي : هذاك منـزلك قال : قلت لهما : بـارك الله فيكمـا ذراني فادخله ، قالا : اما الان فلا وأنت داخله ( في رواية )[٣٦٦] : [ انه قد بقي لك عمـر

---

* ترعة : المكان المرتفع .

[٣٦٥] اخرجه :احمد في ((المسند)) (٢/٣٦٠) ، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٣٦٣)٠

* نور الربيع : من كل انواع اعشاب الربيع .

* الربابة البيضاء : السحابة البيضاء .

[٣٦٦] ((الصحيح الجامع)) ( ٣٤٦٢ ).

لم تستكمله ، فلو استكملته دخلت دارك ] قال : قلت لهما : فاني قد رأيت منذ الليلة عجباً فما هذا الذي رأيت ، قال : قالا لي :(( نعم ... والشيخ في أصل الشجرة ابراهيم عليه السلام والصبيان حوله فاولاد الناس ... والدار الاولى التي دخلت دار عامة المؤمنين وأمّا ( الدار الاخرى ) فدار الشهداء ، وأنا جبريل ، وهذا ميكائيل ))[٣٦٧] واته: (( دوو پیاو لەخەوم دا هاتن بۆلام و هەردوو دەستیان گرتم ......کەوتینە ڕێ تاکو گەیشتە لای باخچەیەك جۆرەها گژوگیای بەهارەی لێ بوو وەبینیم لەناویدا پیاوێکی بالاّ بەرز هەبوو ئەوەند بەرز بوو نزیك بوو سەری نەبینم لە باڵ بەرزیدا بە چواردەوریدامندالانێکی یەکجار زۆری لێ بوو...لەڕیوایەتێکی تردا: بەڕێکەوتین تاکو گەیشتینە باخچەیەکی یەکجار گەورەی سەوز بینیمان درەختێکی زۆر گەورەی تیابوو لە ژێردارەکەدا...پیاوێکی بە تەمەنی سپی تیا بوو لەگەڵ کۆمەڵێك منداڵدا ...بەرزیان کردمەوە بە درەختێکدا و بردمیانە جێگەیەك ،یەکجار خۆش بوو تاوەکو ئێستا جێگای وا خۆشم نەبینیوە ، پیاوانی پیرو گەنج و منداڵ و ئافرەتانی تیابوو ، ئەفەرموێت: ئنجا لەوێ دەریان کردم و بە درەختە کەدا سەرکەوتین و چووینە جێگەیەکی یەکجار خۆشتر وچاکتر ئەویش پیاوی پیرو گەنجی تیا بوو ، [لەڕیوایەتێکی تردا : دەفەرموێت : ڕۆیشتین تاکو گەیشتینە باخێکی سەوزی یەکجار [گەورە] کە تا ئێستا باخی وا گەورە و دڵگیرم نەدیووە ، دەفەرموێت : پێیان ووتم ، پیایدا بەرز بەرەوە ، دەفەرموێت بەرز بوینەوە تیایدا تا گەیشتینە شارێك دیوارەکەی لەخشتی ئاڵتون و لەخشتی زیو دروست کرابوو، تا چووینە بەر دەرگای شارەکە و لەدەرگامانـدا وەدەرگامان بۆکرایەوە و چووینە ژوورەوە ... (لەدوایدا) پێیان ووتم ، ئەوە بەهەشتی عەدنە وە ئەوە خانووی تۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : تەماشای بەرەوژوورم کرد خانوویەکی زۆر بەرزم بینی بەوێنەی پەڵە هەوری گەورەی سپی دەفەرموێت: پێیان ووتم ئائەوە جێگەی تۆیە ، منیش پێم ووتن بەرەکەتی خواتان لێبێت لێم گەڕێن تابچمە ناویەوە ووتیان : ئا ئێستا نەخێر ، بەلاّم تۆ هەردەچیتە ناوی (لەڕیوایەتێکی تردا) ووتیان : [بەلاّم تۆ هەندێ تەمەنت ماوە بەسەری بەریت تەواوت نەکردووە گەر تەواوت کرد بەجێی خۆت دەگەیت ]دوای ئەوە پێم ووتن من سەرتاسەری ئەمشەو شتی زۆر سەیرم بینی

---

[٣٦٧] اخرجه : احمد ((المسند)) (٨/٥) ، والبخاري ((الصحيح)) (١٣٨٦،٧٠٤٧) ، ومسلم ((الصحيح)) (٢٢٧٥) ، والترمذي ((السنن)) (٢٢٩٥) ، وابن حبان ((الصحيح)) (٦٥٥) .

ئەوانە چی بوون کەمن بینیمن؟ پێیان ووتم : ((...ئەو پیاوە بالاّ بەرزەی یەکەمجار بینیت ئـەوە ئیبراهیم بوو ﷺ.وە ئەو منداڵە زۆرەش منداڵی خەڵکان بوو بەچوار دەوریـەوە ...وەخـانووی یەکەمجار کەچویتە ناوی خانووی موسـوڵمانان بـوو بەگـشتی بـەلاّم (خانوەکـەی تـر )خـانووی شەهیدەکان بوو ، وەمنیش جبریلم وئەویش میکائیله])).

وەشەهید ئەوەندە پلەو پایەی بەرزە لای خوا دەتوانێت تکا بۆ حەفتا کەس لەخزمانی خـۆی بکـات.مقـدادی کـوڕی مەعدیـەکروب ﷺ گێڕاویەتیـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ((**للشهيد عند الله ست خـصال ... ، ويـشفع في سـبعين انـساناً مـن أقاربـه**)) [٣٦٨] واتـە : ((شەهید شەش سیفەتی لای خوای خۆی هەیە (( ویشفع فی سبعین انساناً مـن اقاربـه)) واتـە: تکا بۆ حەفتا کەس لەخزمانی خۆی دەکات )) وەشەهیدەکان پلەیان لای خوای گەورە جیاوازە : لەعوتبەی کوڕی عەبد سەلمی یەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: ((**القتلـى ثلاثة : رجل مؤمن جاهد بنفسه وماله في سبيل الله حتى اذا لقي العدو قاتلهم حتـى يقتـل ، فذلك الشهيد الممتحن في خيمة الله تحت عرشه لايفضله النبيون الا بفـضل درجـة النبـوة ، ورجل مؤمن قرف على نفسه من الذنوب والخطايا.... ، جاهد بنفـسه ومالـه في سـبيل الله حتى اذا لقي العدو قاتل حتى قتل ، فتلك مصمصة محت ذنوبـه وخطايـاه ان الـسيف محـاءٌ للخطايا ورجل منافق جاهد بنفسه وماله في سبيل الله حتى اذا لقي العـدو قاتـل حتـى قتـل فذلك في النار ان السيف لا يمحو النفـاق**)) [٣٦٩] واتـە : (( کـوژراو سـێ جـۆرن ، پیـاوێکی باوەڕدار بەنەفس و ماڵی خۆی جیهادی کردووە لەپێناوی خـوادا و بـەدوژمن گەیـشتووە و بـە جەنگ هاتووە لەگەڵیاندا تا کوژراوە ئەوە ئەو شەهیدەیە کەتاقی کراوەتـەوە و لـەژێر دەوارێـك لە ژێر عەرشی پەروەردگاردایە ، ئەوە تەنها پێغەمبەران (علیهم السلام) لەو بەرزتر و گەورەترن بەگوێرەی پلەی پێغەمبەرایەتی خۆیان پێشی کەوتون ، وەجۆری دووەمیان باوەڕدارێکە هەنـدێ

---

[٣٦٨] اخرجه : الترمذي ((السنن)) (١٦٦٣) ، وابن ماجة ((السنن)) (٢٧٩٩) ، وصـححه الـشيخ الالبـاني في ((صـحيح سـنن الترمذي)) (١٣٥٨) ، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢٢٥٧) ، وفي ((المشكاة)) (٣٨٣٤)٠

[٣٦٩] اخرجـه: احمـد ((المـسند)) (١٨٥/٤) ، والـدارمي ((الـسنن)) (٢٠٦/٢) ، والطبرانـي ((المعجـم الكـبير)) (٣٠١/١٧) ، والبيهقي ((السنن الكبرى)) (١٦٤/٩) وجوّد اسناد احمد الحافظ المنذري ((الترغيب والترهيب)) (٢٠٤٢) — وابـن حبـان ((الصحيح)) (٤٦٦٣) وقال محققه :اسناده حسن ، وحسنه الشيخ الألباني في (( صحيح الترغيب))(١٣٧٠)

گوناح و تاوانی ئەنجام داوە ئەویش جیهادی کردووە لەپێناوی خوادا بەنەفس ومالّی خۆی هەتاوەکو بەرەو ڕووی دوژمن بۆتەوە و لە ڕوویاندا جەنگاوە تا کوژراوە، ئەوە سڕەرەوەیە و هەموو گوناح و تاوانەکانی سڕیوەتەوە، چونکە شمشێر هەموو گوناهێك دەسڕێتەوە ، وەجۆری سێیەمیان پیاوێکی دوو ڕووە ئەویش جیهادی کردووە (واتە: لەپێش چاوی خەڵکی بەلاّم هەرگیز بڕوای نەبووە) بەنەفس و بەمالّی تاوەکو ڕووبەڕوی دوژمن بۆتەوە و جەنگاوە تاکوژراوە، ئەوەیان لەناو ئاگردایە چونکە شمشێر نابێتە هۆی سڕینەوەی دووڕوویی ونیفاق )).

وەباشترین شەهیدانیش لای خوای گەورە ، ئەوشەهیدانەن لەڕیزی پێشەوەی بەرەکانی شەڕدا دەجەنگێن و بەهیچ جۆرێك ئاوڕنادەنەوە بەملاو لادا تاکو نەکوژرێن.

لەنەعیمی کوڕی حەمارەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**أفضل الشهداء ((عند الله يوم القيامة)) الذين يقاتلون في الصف الاول فلا يلفتون وجوههم حتى يقتلوا اولئك يتلبطون في الغرف العلى من الجنة ويضحك اليهم ربهم وإذا ضحك الى قوم فلا حساب عليهم**))[٣٧٠] واتە: (( باشترینی شەهیدەکان لای خوای پەروەردگار ((لەڕۆژی قیامەتدا ئەوانەن کە لەڕیزەکانی پێشەوەی شەڕدا دەجەنگێن ئاوڕنادەنەوە بەملاو لادا تا دەکوژرێن ، ئەوانە خۆش ڕادەبوێرن لەکۆشکە بەرزەکانیان لەناو بەهەشتدا وەخوای پەروەردگاریش بۆیان پێدەکەنێت وە پەروەردەگا بۆ هەرکەسێك پێ بکەنێت لێپرسینەوەیان لەسەر نیە)).

وەجگە لەو شەهیدانەی کەلەشەڕدا کوژراون هەندێ جۆری تریش دەگەیەنرێنە ئەو پلەیە لەوانە ئەوانەن کەبەنەخۆشی و تاعون وسەرتان مردوون .لەعرباصی کوڕی ساریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((**يختصم الشهداء والمتوفون على فرشهم الى ربنا ، في الذين يُتَوفّون من الطاعون ، ، فيقول الشهداء : اخواننا قتلوا كما قتلنا ، ويقول المتوفون على فرشهم : اخواننا ماتوا على فرشهم كما متنا ، فيقول ربنا : انظروا الى جراحهم فان اشبه جراحهم جراح المقتولين ،**

---

[٣٧٠] اخرجه : احمد ((المسند)) (٢٨١/٥) ، والطبراني ((الأوسط)) (٤١٤٣) ، وقال المنذري ((الترغيب)) (٢٠٤٦) :اسناده حسن، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (١١٠٧،٣٧٤٠).

فانهم منهم ومعهم فاذا جراحهم قد اشبهت جراحهم )) [٣٧١] واته : (( شـەهیدەکان لەگـەڵ موسوڵمانەکان کە لەسەر جێگە مردوون ، هەر دووکیان دەبێت بەدەمەقاڵێیان خوای پەروەردگار دادوەرێتیان دەکات ، لەبرایانەیان کەبەتاعون مردوون .

شەهیدەکان دەڵێن: براکانمان کوژراون وەك چۆن ئێمە کوژراین ، وەئەوانەشی کە لەسە رجێگـەدا مردوون دەڵێن: براکانمان چۆن ئێمە لەسەر جێگە مردین ئەوانیش هـەر لەسـەر جێگـە مـردن ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت : سەیری برینەکانیان کەن گەر برینە کانیان لە شەهیدەکان بچێت ئەوە لەوانن و لەگەڵیاندان کەسەیر دەکەن برینەکانیان لەبرینەکانی شەهیدەکان دەچـێت [واتـە: لەگەڵ شەهیداندا دەبن و بەپلەی ئەوان دەگەن ] )).

وەخوای گەورە پلەوپایەی شەهیدەکان دەدات بەوکەسانەی داوای شـەهیدیان لـەخوای گـەورە کردووە بەنیەتێکی پاکەوە لەدونیادا : پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: ((مـن سـأل الله الـشهادة بصدق ، بلّغه الله منازل الشهداء ، وان مات على فراشه )) [٣٧٢] واته : (( هەرکەسێك داوای شەهیدی لە خوای گەورە بکات بەنیەتێکی ڕاست و پاکەوە ئەوا خوای گەورە دەیگەیەنێتە پلەی شەهیدەکان هەرچەندە لەسەر جێگەکەی خۆشیدا مردبێت )).

وەسەروەری شەهیدەکان لای خوای گـەورە حـەمزەی مـامی پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەئـەو کەسانەش کەفەرمانی چاکە دەکەن بەپێشەوا ستەم کارەکان و ڕێیان لێـدەگرن لـەکاری خراپـەو دەکوژرێن: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((سيد الشهداء (عند الله يوم القيامة) حمزة بـن عبـد المطلب ، ورجل قام الى امام جائر فامره ونهاه فقتله)) [٣٧٣] واتـە : ((سـەروەری شـەهیدەکان (لای خـوای گـەورە لەقیامـەت دا) (حـەمزەی کـوڕی عبـد المطلـب)ە ﷺ پاشـان پیاوێکـە ، بەرەنگاری پێشەوایەکی ستەمکار بۆتەوە و فەرمانی بەچاکە پێ کردووە و ڕێگـری کـردووە لـە خراپە و پاشاکەش کوشتویەتی )) .

---

[٣٧١] اخرجه : النسائي ((السنن)) (٦/٣٧) ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن النسائى)) (٢٩٦٦) ، و((صحيح الترغيب)) (١٤٠٦).

[٣٧٢] اخرجه : مسلم ((الصحيح)) (١٩٠٩) ، وابوداود ((السنن)) رقم (١٥٢٠) ، والنسائي ((السنن)) (٦/٣٦)، وابن ماجة ((السنن)) (٢٧٩٧).

[٣٧٣] اخرجه : الحاكم ((المستدرك)) (٣/١٩٥) وصححه ، والطبراني ((المعجم الكبير)) (١/٣٠٠) ، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٣٧٤) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٣٦٧٥).

وەشەهید پاداشتی زۆرە لەبەر ئەوەشە کەس خۆزگە ناخوازێت بگەڕێتەوە ژیانی دونیا تەنها شەهید نەبێت بۆ ئەوەی دەیەها جار لەپێناوی خوادا بکوژرێت و پاداشت و پلە وپایەی زۆرتر دەست خۆی بخات لەلای خوای گەورە .

ئەنەس ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**ما من أحد يدخل الجنة يحب أن يرجع الى الدنيا ، وان له ما على الارض من شئ غير الشهيد فأنه يتمنى أن يرجع الى الدنيا فيقتل عشر مرات لما يرى من [ فضل الشهادة ]**))[٣٧٤] واتە: (( هەرکەسێك بچێتە ناو بەهەشتەوە پێی خۆش نیە بگەڕێتەوە دونیا گەر هەموو ئەو شتانەی پێ‌ی بدرێت کە لەسەر ڕووی زەویدا هەیە جگە لە شەهید نەبێت ئەو ئاواتە خوازە بگەڕێتەوە دونیا و دەجاری تریش بکوژرێت ، چونکە ئەو بینیویەتی پاداشتی شەهیدی چەندە گەورەیە)).

## ئاژەڵ و باڵندەو دروست کراوەکانی تری ناو بەهەشت

لە بەهەشت دا خوای گەورە ئاژەڵ و ئەسپ و وشتری تیا دروست کردووە : لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە دەفەرمویێت : ((**ان رجلاً سأل النبي ﷺ فقال : يارسول الله هل في الجنة من خيل؟ قال :[ ان أدخلك الله الجنة فلا تشاء أن تحمل فيها على فرس من ياقوتة حمراء يطيربك في الجنة حيث شئت ]قال: وسأله رجل فقال : يارسول الله هل في الجنة من ابل ؟ )) قال : فلم يقل ماقال لصاحبه ، قال: (( ان ادخلك الله الجنة يكن لك فيها ما اشتهت نفسك ولذّت عينك)) قال: ((ان ادخلك الله الجنة يكن لك فيها ما اشتهت نفسك ولذّت عينك))**[٣٧٥]

واتە : ((پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد ئایا لە ناو بەهەشت دا ئەسپ هەیە ؟ پێغەمبەر فەرمووی: (( گەر خوای گەورە تۆ بکاتە ناو بەهەشتەوە چۆن ویستت لێی بێت لە سەر پشتی ئەسپێك لە یاقوتی سور لە ناو بەهەشتدا هەڵتدەگرێت بۆ ئەو جێگەیەی کەخۆت پێت خۆشە ))

---

[٣٧٤] اخرجه : احمد ((المسند)) (١٠٣/٣) ، والبخاري ((الصحيح)) (٢٨١٧) ، ومسلم ((الصحيح)) (١٨٧٧) واللفظ له .

[٣٧٥] اخرجه : احمد ((المسند)) (٣٥٢/٥) ، وعبد الرزاق (٦٧٠٠) ، والطيالسي (٨٠٦) ، و الطبراني ((الأوسط)) (٥٠١٩) ، والبيهقي ((البعث)) (٣٩٣) ، والترمذي ((السنن)) (٢٥٤٣) ، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (٥٦٤٢)، وفي ((صحيح الترغيب ))(٣٧٥٧)، و ((الصحيحة)) (٣٠٠١).

وەپرسیاری لێکرد ئەی ووشتر هەیە لەناو بەهەشت دا ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((واتە: گەر خوای گەورە تۆ بکاتە ناو بەهەشتەوە ئەوەی چاو ودڵت پێی خۆشە بۆ تۆ دەبێت و هەمووی بەدڵی خۆت دەبێت)).

وە هەروەها لەئیبن و مەسعودەوە ﷺ دەفەرموێت : (( **جاء رجل بناقة مخطومةٍ ، فقال : يا رسول الله ان هذه الناقة في سبيل الله قال : لك بها سبعمائة ناقة مخطومةٍ في الجنة**))[٣٧٦] واتە: ((پیاوێك هات ووشترێکی پێ بوو ووتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەم ووشترەم بەخشی لەپێناوی خوادا پێغەمبەریش فەرمووی: حەوت سەدو وشتری ئاوات پێدەدرێت لە ناو بەهەشتدا)).

# ئومەتی پێغەمبەر ﷺ زۆرترین خەڵکی بەهەشتن

یەکەم تاقم کەدەچنە ناوبەهەشت لەئومەتی پێغەمبەر ﷺ حەفتا هەزار کەسن ئەوانەن کە نەلێپرسینەوەیان لەسەرە نەسزا ، وەخوای گەورە پاشان زیادی کرد لەگەڵ هەریەکێك لەوان حەفتا هەزار کەسی تر لەگەڵ و سێ مشت لەمشتەکانی پەروەردگار کە دەچنە بەهەشت ، جگە لەوانەی بەشەفاعەتی پێغەمبەری خۆمان و پێغەمبەرانی تر (علیهم السلام) وفریشتە بەڕێزەکان و تکای باوەڕدارەکان لەگەڵ ئەوانی بەر ڕەحمەتی خوای گەورە دەکەن و بەم جۆرەش کۆمەڵانێکی زۆر لەناو ئاگری دۆزەخ دەهێنرێنە دەرێ و دەخرێنە ناو بەهەشت ٠

لەئەبو بەکرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**أعطيت سبعين ألفاً ((من أمتي)) يدخلون الجنة بغير حساب، وجوههم كالقمر ليلة البدر ... فاستزدت ربي عزوجل، فزادني مع كل واحد سبعين الفاً**))[٣٧٧] واتە: (( پێم بەخشراوە حەفتا هەزار کەس ((لەئومەتەکەم)) بەبێ حساب بچنە بەهەشت ڕوویان وەك مانگی شەوی چواردە یە ...داوای زیاترم لەپەروەردگارم کرد ، ئەویش لەگەڵ هەریەکێکدا حەفتا هەزار کەسی تری پێ بەخشیم

---

[٣٧٦] اخرجه : ابو نعيم ((الحلية)) (١١٦/٨) ، والحاكم ((المستدرك)) (٩٠/٢) ، وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي ، وصححه الشيخ الالباني ((السلسلة الصحيحة)) (٦٣٤) واللفظ لابي نعيم ٠

[٣٧٧] اخرجه : احمد ((المسند)) (٦/١) ، وابويعلي ((المسند)) رقم: (٣٧٨٣) ، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٤٨٤) ، وفي ((صحيح الجامع)) (١٠٥٧)٠

کەدەچنە ناو بەهەشت )). وەئەم ژمارەیە زۆر کەمە بە بەراورد لەگەڵ ژمارەی بێ باوەڕو دۆزەخیەکاندا -والله اعلم- ئیبن و مەسعود ﷺ دەفەرموێت :

(( لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین لە خێمەیەکدا و فەرمووی : [ئایا ڕازی دەبن چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن ] ووتمان بەڵێ : فەرمووی : [ئەی ڕازی دەبن سێ یەکی خەڵکی بەهەشت بن ]ووتمان : بەڵێ، پاشان فەرمووی : [سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە من هیوام وایە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن ، چونکە بەهەشت هەر نەفسێك موسوڵمان نەبێت ناچێتە ناوی ، نمونەی ئێوە لەناو کافران و خەڵکی مشیرك وەکو مویەکی سپی وایە لە پێستی گایەکی ڕەش دا یاخود مویەکی ڕەش لەپێستی گایەکی سوردا ])) [٣٧٨].

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە موسوڵمانانی ئوممەتەکەی هەشتا پۆلن لە بنچینەی سەدو بیست پۆلی خەڵکی بەهەشت . لە بورەیدەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**أهل الجنة عشرون ومائة صف ، ثمانون منها من هذه الامة ، وأربعون من سائر الامم** )) [٣٧٩]. واتە : (( خەڵکی بەهەشت سەدو بیست پۆلن ، هەشتا پۆلیان لەم ئوممەتەن وە چل پۆلەکەی تریان لە ئوممەتەکانی تری پێشون )).لە ڕیواتێکی تردا (ابن عمر ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (( **مامن أمةٍ الاّ و بعضها في النار و بعضها في الجنة الاّ أمتي فانها كلها في الجنة**)) [٣٨٠] واتە: هەموو ئوممەتێك هەندێکیان لەبەهەشتدان وە هەندێکی تریان لە دۆزەخدان تەنها ئوممەتەکەی من نەبێت هەموویان لەبەهەشتدان.

# کەمترین پلەی خەڵکی بەهەشت

پێغەمبەر موسا ﷺ پرسیاری لەخوای گەورە کرد لەبارەی کەمترین پلەی و نزمترین خەڵکی بەهەشت و زۆرترین و بەرزترین پلەی خەڵکی بەهەشت ، وەکو لە فەرموودەکەی موغەیرەدا ﷺ هاتووە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**ان موسى سال ربه ما**

---

[٣٧٨] أخرجه : احمد ((المسند)) (٣٨٦/١) ، والبخاري ((الصحيح)) (٦٥٢٨) ، ومسلم ((الصحيح)) (٣٧٧).

[٣٧٩] أخرجه: احمد ((المسند)) (٣٦٦١) ، وابويعلى ((المسند)) (٢٤٩/٢) ، والبخاري ((الصحيح)) (٦٥٢٨) ، ومسلم ((الصحيح)) (٣٧٦).

[٣٨٠] أخرجه : الخطيب ((التأريخ)) (٣٧٦/٩) و قال الأحدب ((زوائد تأريخ بغداد)) (١٤٢٤) : رجاله ثقات واخرجه الطبراني ((الأوسط)) (١٨٥٨) واسناده صحيح ، وصححه الشيخ الألباني في (( صحيح الجامع)) (٥٦٩٣).

**ادنى أهل الجنة منـزلة ؟ فقال : رجل يجئ بعدما دخل اهل الجنة ، فيقال له : ادخل الجنـة ، فيقول : رب كيف وقد نزل الناس منازلهم واخذوا اخذاتهم ؟ فيقال له : أترضى ان يكـون لك مثل ملك من ملوك الدنيا فقال : رضيت رب ، فيقول: لك ذلك ومثلـه ومثلـه ومثلـه ومثله فقال في الخامسة : رضيت رب ، فيقول : هذا لك وعشرة أمثاله ، ولك مـا اشـتهت نفسك ولذت عينك فيقول : رضيت رب ... ))** [٣٨١]. واته : (( موسا(عليه السلام) پرسـیاری لـه خوای گەورە کرد کەمترین پلەی خەڵکی بەهەشت چەندە؟ فەرمووی پیاوێکە دێت ، دوای ئەوەی خەڵکی بەهەشت دەکرێنە ناو بەهەشت ، پێی دەوترێت : بچۆرە ناو بەهەشت ئەویش دەڵێـت : خوایە چۆن بچمە ناو بەهەشت دوای ئەوەی خەڵکان هەموو شوێن و پلەی خۆیان دەست کەوتوە؟ پێی دەوترێت: ئایا ڕازی دەبیت بەقەدەر پاشایەك لەپاشاکانی دونیا بۆ تۆ بێت : ئەویش دەڵێت : بەڵێ ڕازیم ، وە دەفەرموێت : ئەوا ئەوەندەو ئەوەنـدە و ئەوەنـدە وئەوەنـدەی تـریش بـۆ تـۆ لەپێنجەمدا دەفەرموێت : ڕازیم ئەی پەروەردگار ، وە خوای گەورە پێی دەفەرموێت : ئەوەندەو ئەوەندەی تریش بۆ تۆ ، وەچی نەفست پێی خۆشە و چاوت پێی خۆشە بۆ تۆ ئـەویش دەڵێـت : ڕازیم ئەی پەروەردگار .......)) لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((..**فیقـول الله عزوجـل : سل وتمنه فيسأل ويتمنى مقدار ثلاثة أيام من أيام الدنيا ، ويلّقنه الله مالا علم له بـه فيـسأل ويتمنى ، فاذا فرغ قال : لك ما سألت. ((قال ابـو سـعيد : ومثلـه معـه فقـال ابـوهريرة : وعشرة امثاله)) .. ))** [٣٨٢] واته : ((خوای گەورە دەفەرموێت داوا بکەو ئاوات بخوازە ، ئەویش داوا لەخوا دەکات و ئاوات دەخوازێت بەماوەی سێ ڕۆژ لە ڕۆژەکـانی دونیـا، وەخـوای گـەورە فێری دەکات بەوەی کەئەو زانیاری لە بارەوە نی یە، ئینجا ئەویش داوای دەکات و ئـاواتی پـێ دەخوازێت ،کاتێ کە تەواو بوو پێی دەوترێت: بڕۆ ئەوەی کە داوات کرد بۆ تۆ ..((ئەبو سەعید رضي الله عنه دەفەرموێت : لەگەڵ هاوشێوەکەیدا ئەبو هـورەیرە رضي الله عنه دەفـەرموێت : لەگـەڵ دەئەوەنـدەی کەداوات کردووە ))...)).

---

[٣٨١] أخرجه : مسلم ((الصحيح)) (١٨٩) واللفظ له ، والحميدى ((المسند)) (٧٦١) ، والترمذي ((السنن)) (٣١٩٨) ، وابـن ابي شيبة ((المصنف)) (١٣/١٢٠) ، وابن حبان ((الصحيح)) (٦٢١٦).

[٣٨٢] اخرجه : احمد ((المسند)) (٣/٧٤) ، والبزار (٣٥٥٥)، وضعفه الشيخ الألبـاني في (( ضـعيف الترغيـب)) (٢١٨٢).ولـه شواهد في الصحيحين.

لە ڕیوایەتێکی تردا : ((فيسأل ربه فيتمنى حتى ان الله ليذكرهُ فيقول : تمن كذا وكذاوكذا...))[٣٨٣] واتە : (( داوا دەکات و خوای گەورە زۆرشتی بەبیر دەهێنێتەوە تا داوای بکات و دەڵێ...ئەوە و ئەوە داوا بکە و ئاواتێ بخوازە )).

وە کەمترین پلەی خەڵکی بەهەشت کە خوای گەورە دەیبەخشێت سامانەکەی بەوێنەی گوێ زەوی یەو دەقاتی ئەویش وە موڵکێکی دەدرێتێ کە ماوەی سەد ساڵە و بەچاوی خۆی دەیبینێت ٠

ئیبن و مەسعود ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((... فيقول : تمنه ، فيقول : يارب ، تنافس أهل الدنيا في دنياهم وتضايقوا فيها ، فانا أسالك مثلها ، فيقول : لك مثلها وعشرة أضعاف ذلك ، فهو أدنى أهل الجنة منزلاً)) [٣٨٤] واتە : (( پێی دەوترێت ئاوات بخوازە ، ئەویش دەڵێت : خوای گەورە خەڵکی دونیا لەسەر دونیای خۆیان پێش بڕکێی یەکتریان دەکرد بۆ بوون بە خاوەنی من داوای هاوشێوەی دونیات لێ دەکەم ، پێی دەوترێت : هاوشێوەی دونیا لەگەڵ دە ئەوەندی دونیا بۆ تۆ ، ئەوە کەمترین جێگە و پلەی خەڵکی بەهەشتە)).

وە هەروەها لە ڕیوایەتێکی تردا بەسەرهاتی ئەو پیاوە باس دەکات کە دەچێتە بەهەشت و کەمترین پلەی هەیە لە بەهەشت دا : ئیبن و مەسعود ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( ..حتى يمر الذي يعطى نوره على ظهر قدميه يحبو* على وجهه ويديه ورجليه تخر يد وتعلّق يد وتّخر رجل وتعلّق رجل وتصيب جوانبه النار ، فلايزال كذلك حتى يخلص، فاذا خلص وقف عليها ، فقال : الحمد لله الذي أعطاني مالم يعط أحداً اذ نجاني منها بعد اذا رأيتها قال : فينطلق به الى غدير عند باب الجنة فيغتسل ، فيعود اليه ريح أهل الجنة وألوانهم فيرى ما في الجنة من خلال الباب ، فيقول : رب ادخلني الجنة فيقول له : أتسأل الجنة وقد نجيتك من النار ؟ فيقول : رب اجعل بيني وبينها حجاباً لا أسمع حسيسها ، قال : فيدخل الجنة فيرى أو يرفع له منزل أمام ذلك كأن ماهو فيه اليه حلم فيقول : رب اعطني

---

(٣٨٣) اخرجه :البخاري ((الصحيح)) (٦٥٧٣) ، ومسلم ((الصحيح)) (١٨٢)٠

(٣٨٤) اخرجه : احمد ((المسند)) (٣٧٨/١) ، وابن حبان ((الصحيح)) (٧٤٢٧) وقال محققه اسناده صحيح٠

* يحبو : أي ان يضم الانسان رجليه الى بطنه . انظر : (( النهاية ٣٣٥/١ )) .

ذلك المنـزل ، فيقول له : لعلك ان أعطيتكه تسأل غيره فيقول : لا وعزتك لا أسالك غيره وأي منـزل يكون احسن منه قال : فيعطاه فينزله . ويرى أمام ذلك منـزلاً اخر كـأن مـاهو فيه اليه حلم ، فيقول : رب أعطني ذلك المنـزل ، فيقول الله تعالى له : فلعلـك ان اعطتكـه تسأل غيره ، فيقول : لا وعزتك يارب لا أسال غيره ، واي منـزل يكون أحسن منه قال : فيعطاه فينـزله ثم يسكت فيقول: الله عزوجل : مالك لا تسأل ؟ فيقول : رب لقد سـألتك حتى استحييتك وأقسمت لك حتى استحييتك)).

واتە: دواهەمین کەس کە [ لە دۆزەخ دێتە دەرێ لە موسوڵمانان ] ئـەو کەسـەیە کـە نـورێکی کەمی پێ دەدرێت لە سەری پەنجە گەورەی جارێك هەڵدەبێت و جارێك دەکوژێتەوە تاکو دەچێتە سەرپردی صیرات کـە دەپەڕێتـەوە دەسـتێکی دەخزێـت بەدەسـتەکەی تـری خـۆی دەگرێتـەوە وقاچێکی هەڵدەخزێت و بە قاچەکەی تری خۆی دەگرێتەوە دەڕوات بەسـکە خـشکێ تادەچـێتە ئەوبەر و ئەم لاوئەولای ئاگری بەردەکەوێت بـەم شـێوەیە دەبێـت تـاکو دەپەڕێتـەوە و ڕزگـاری دەبێت کە دەچێتە ئەو بەر بەپێوە دەوەستێت وسەیری پردی صیرات دەکات و دەڵێت : سـوپاس بۆ ئەو خوایەی ئەوەی کەبەخشیویەتی بەمن نەی بەخشیوە بەهیچ کەسێك کە ڕزگاری کردم لـە ئاگر لەدوای ئەوەی کە بە چاوی خۆم بینیم ئەنجا ئەو پیـاوە دەبرێـت بـۆ لای تافـە ئاوێـك کـە لەبـەردەم دەرگـای بەهەشـتدایە خـۆی تێـدا دەشـۆرێت و ڕەنـگ و بـۆنی بەهەشـتیەکانی بـۆ دەگەڕێتەوە و لەوێدا لە دەرگای بەهەشتەوە هەموو ناو بەهەشت دەبینێت و پاشان دەڵێت: ئەی پەروەردگار بمکەرە ناو بەهەشتەوە ؟ خـوای گـەورە پـێی دەفـەرموێت : ئایـا داوای بەهەشـت دەکەیت دوای ئەوەی لە دۆزەخ ڕزگارم کردیت ؟ ئەویش دەڵێت : ئەی پەروەردگار لە نێوان من و بەهەشت دا پەردەیەك دروست بکە تاگوێم لە دەنگی ناو بەهەشت نـەبێت ئـەنجا دەکرێتـە نـاو بەهەشتەوە و کۆشکێکی بەرزی پێنیشان دەدرێت لەبەردەمیدا کەوا دەزانێت ئەو لە خەیاڵدایـە وە دەڵێت : ئەی پەروەردگار ئەو کۆشکەم پێ ببەخشە؟ خوای گەورەش پێی دەفەرموێت : گـەر ئەو کۆشکەت بـدەمێ ئایـا داوای کۆشـکی تـر دەکـەیت ، ئـەویش دەڵێـت : نـا سـوێند بـە شکۆمەندی تۆ داوای کۆشکی ترت لێی ناکەم جا کۆشك هەیە لەوە باشـتر بێـت؟ ئـەنجا خـوای پەروەردگار کۆشکەکەی دەداتێ و دەچێتە ناوی . وەلەبەردەم ئەوە وە کۆشکێکی تـر دەبینێـت وادەزانێت ئەوەی تیایەتی بەلای ئەوەوە خەیاڵە ئەنجا ، دەڵێت: ئەی پـەروەردگار ئـەو کۆشـکەم

پێببەخشە : خوای گەورەش دەفەرمویت : گەر ئەو کۆشکەت پێببەخشم داوای کۆشکی تر دەکەیت؟ ئەویش دەڵێت : نەخێر سوێند بەشکۆمەندی تۆ ئەی پەروەردگار داوای هیچی ترناکەم ، چ کۆشکێك دەبێت لەوە چاکتر بێت ئەنجا ئەو کۆشکەشی پێدەبەخشێت پاشان بێدەنگ دەبێت ، خوای گەورەش دەفەرموێت : ئەوە چیتە بۆ داوا ناکەیت ؟ ئەویش دەڵێت : پەروەردگارم ئەوەندەم لێ داوا کردیت تا شەرمت لێ دەکەم کە داوای شتی تر بکەم وە ئەوەندەم سوێند بۆ خواردیت تا تەواو شەرمت لێ دەکەم ، ((فيقول الله عزوجل : الم ترض أن اعطيك مثل الدنيا منذ خلقتها الى يوم أفنيتها وعشرة أضعافه ؟ فيقول : اتستهزئ بي وأنت رب العزة ؟ فيضحك الرب تبارك وتعالى من قوله : ( ... ) قال : فيقول : الرب عزوجل : لا ولكني على ذلك قادر ، سل فيقول : ألحقني بالناس ، فيقول: الحق بالناس فينطلق يرمل* في الجنة حتى اذا دنا من الناس رفع له قصر من درة فيخر ساجداً ، فيقال له : ارفع رأسك مالك فيقول : رأيت ربي أو ترأى لي ربي ، فيقال له : انما هو منزل من منازلك . قال : ثم يلقى رجلاً فيتهيأ للسجود له فيقال له : مه مالك ، فيقول : رأيت انك ملك من الملائكة فيقول : انما أنا خازن من خزانك وعبد من عبيدك تحت يدي الف قهرمان على مثل ما أنا عليه .)) خوای گەورەش دەفەرموێت : ئایا ڕازی نابیت بەوێنەی هەموو دونیات پێ ببەخشم لەو ڕۆژەی کەدروستم کردووە تاکو ئەو ڕۆژەی لەناوم بردووە وهاوشێوەی ئەوەش ؟ ئەویش دەڵێت ئایا گاڵتەم پێدەکەیت تۆ پەروەردگاری بەدەستەلاتی ؟ خوای گەورەش بەقسەی ئەو پیاوە پێدەکەنێت: (.........) : خوای گەورە دەفەرموێت : نەخێر من توانام بەسەر ئەوەدا هەیە داوابکە : ئەویش دەڵێت بمگەیەنەرە خەڵکان ،خوای گەورەش دەفەرموێت : بگە بەخەڵکان ئەویش دەچێت بەخێرای لەناو بەهەشت دا دەڕوات تا نزیك دەبێتەوە لەخەڵکان ، ئەنجا کۆشکێکی مرواری دێتە بەرچاوی ئەویش یەکسەر بەسوجدەدا دەچێت ، پێی دەوترێت سەرت بەرزکەرەوە ئەوە چێتە ، ئەویش دەڵێت: خوای پەروەردارگام بینی یان خوای گەورە خۆی نیشان دام ، پێی دەوترێت : بەڵام ئەوە کۆشکێك بوو لەکۆشکەکانی تۆ ، پاشان بە پیاوێك دەگات ئەویش خۆی ئامادە دەکات تا سوجدەی بۆ بەرێت پێی دەوترێت : بوەستە ئەوە چی دەکەیت

* يرمل : وهو ضرب بين المشي والسعي .

ئەویش دەڵێت: واهاتە بەرچاوم کە تۆیەکێك بیت لەفریشتەکان ؟ ئەو کەسەش پێی دەڵێت: من تەنها دەرگاوانی کۆشکەکەی تۆم و بەندە و خزمەت کاری تۆم هەزار کەسم لەژێر دەستدایە هەموویان ئیش و کار دەکەن و بە وێنەی منن ((قال : **فينطلق أمامه حتى يفتح له القصر قال : وهو من درّة مجوّفة سقائفها وأبوابها وأغلاقها ومفاتيحها منها ، تستقبله جوهرة خضراء مبطنة بحمراء ، فيها سبعون باباً كل باب يفضي الى جوهرة خضراء مبطنة ، كل جوهرة تفضي الى جوهرة على غير لون الاخرى ، في كل جوهرة سرر وأزواج ووصائف أدناهنّ حوراء عيناء عليها سبعون حلة يرى مخ ساقيها من وراء حللها ... فيقال له : اشرف فيشرف فيقال له : ملكك مسيرة مائة عام ينفذه بصرك ]. فقال عمر : الا تسمع ما يحدثنا ابن ام عبد ياكعب عن أدنى أهل الجنة منزلاً فكيف أعلاهم ...** ))[٣٨٥] دەفەرموێت : خزمەت کارەکەی دەڕوات لەپێش خۆیەوە و کۆشکێکی بۆ دەکاتەوە کە لەمرواری ناوبۆشە و دەرگاکانی و کلیلەکانیشی هەر هەمووی لەمرواری یە و کۆشکێك لە بەردەمیدا دەبینێت لە گەوهەری سەوز دروست کراوە کە ناوەوەی سوورە و حەفتا دەرگای تیایە هەموو دەرگایەك لەو دەرگایانە دەچێت بۆ کۆشکێکی تر و ڕەنگی هیچیان لەوی تریان ناچێت ، لە هەر کۆشکێك لەوکۆشکانە هاوسەر و خزمەت گوزارو ڕاخەرو قەرەوێڵەی تێدایە کەمترینیشیان حۆریەکە حەفتا پۆشاکی [ئاوریشمی ناسکی] لەبەردایە و ئێسکی هەردوو قاچی لە ژێر ئەو هەموو پۆشاکەوە دەبینرێت ...پاشان پێی دەوترێت : بەرز بەرەوە ، ئەویش لە کۆشکەکەیەوە بەرز دەبێتەوە و پێی دەوترێت : موڵکی تۆ ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی سەد ساڵە و چاوی خۆت هەمووی دەبینێت .ئیمامی عومەر فەرمووی : ئایا گوێت لێ نی یە کوڕی ئوم عەبد چیمان بۆباس دەکات لەبارەی کەمترین پلەی خەڵکی بەهەشت کەعب ئەی دەبێ پلەبەرزەکانیان خوای گەورە

---

[٣٨٥] اخرجه : الطبراني ((المعجم الكبير)) (٦٧٦٣) ، والحاكم ((المستدرك)) (٣٧٦/٢) و (٥٩٠/٤) صححه ووافقه الذهبي ، والبيهقي ((البعث)) (٤٧٩)، وعبدالله بن احمد ((السنة)) (١٢٠٣) وقال محققه اسناده حسن ، وقال المنذري ((الترغيب والترهيب)) (٥٢٦٥) : رواه ابن ابي الدنيا والحاكم واحد طرق الطبراني صحيح ، وقال ابن القيم ((حادى الارواح))كما في: ((مختصر حادى الارواح)) (ص: ٢٨٢) حديث كبير حسن ، وقال الهيثمي ((مجمع الزوائد)) (٣٤٣/١٠) : رواه الطبراني من طرق واحدهما رجاله رجال الصحيح ، وصححه الشيخ الالباني في ((مختصر شرح العقيدة الطحاوية)) رقم: (٢٦٤) ، وفي ((مختصر العلو)) (٦٩) (ص: ١١٠) ، وفي ((صحيح الترغيب)) (٣٧٠٤) ، وصححه الشيخ الأرناؤوط في ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٦٠٦/٢) وقال :حديث صحيح.

چییان پێ ببەخشێت...)).بۆیە حەسەنی بەصری دەفەرموێت : " **لاتطیبُ لأحدٍ الحیاة الاّ في الجنة**"[٣٨٦]. واتە: ژیانی خۆش بۆ هەموو کەسێك تەنها لەبەهەشتدایە .

# نیعمەتەکانی ناو بەهەشت وەسف ناکرێت

بەهەشت بارەگای هەموو نیعمەتەکانە، بەهەشتیەکان تیایدا لەو نیعمەتانە خۆش گـوزەرانن کە خوای گەورە پێی بەخشیون لە ژمارده و باس کـردن نایـەن .بـۆ یـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرموێت : (( **من یدخل الجنة ینعم ولا ییأس ، ویخلد ولا یموت ولا یبلى ثیابهم ولا یفنـى شبابهم**))[٣٨٧] واتە : (( هەر کەسێك بچێتە ناو بەهەشت خۆش گوزەران دەبێت و هەژار نابێت، وە هەتا هەتایە دەمێنێتەوە و نامرێت و پۆشاکەکانیان کۆن بوون و ڕزینـی بەسـەردا نایـەت و گەنجێتیشیان لە ناو ناچێت )) ٠ لەبەر ئەوە بانگی خەڵکی بەهەشت دەکرێـت وە مـژدەیان پـێ دەدرێت کە کاتی ئەوە هاتووە لەخۆش گوزەرانیدا بژین و هەرگیز نارەحەتی ڕوویان تێ نـەکات. ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**اذا دخل أهل الجنـة الجنة یناد مناد ..... ، وان لکم ان تنعموا فلا تبأسوا أبداً** ))[٣٨٨] واتـە : (( کـاتێ خـەڵکی بەهەشت دەچنە ناو بەهەشتەوە جاڕدەرێك جاڕ دەدات و دەڵێت : ئێستا کاتی ئەوە هـاتووە بـە خۆش گوزەرانی بژین و هەرگیز هەژار و بێ هیوا نەبن..)). هـەموو سـامانی دونیـا بـستێکی خاکی بەهەشت ناهێنێت ، وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((.... **لقـاب قـوس أحـدکم أو موضع یده في الجنة خیر من الدنیا ومـا فیهـا** ...))[٣٨٩] واتـە : (( بـە ئەنـدازەی دارکـەوانی یەکێکتان یاخود جێ دەستی یەکێکتان لەبەهەشت دا زۆر چاکترە لە دونیا و لەوەشی لـەدونیادا هەیە.....)).وە دونیا هەمووی ڕووناك دەبێتەوە گەر بە وێنەی سەرە نینۆنێك بەهەشـت لێ ی دەرکەوێت ...وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت : ((**لو أن مایقـل ظفـر مما في الجنـة بـدا**

---

[٣٨٦] أخرجه : الأصبهاني ((سیرة السلف)) (٧٤٢/٣).

[٣٨٧] أخرجه : مسلم ((الصحیح)) (٥٣٤/٢) و الترمذي ((السنن)) رقم: (٢٥٢٦) وصححه الشیخ الالبـاني في ((صـحیح سـنن الترمذي)) (٢٠٥٠) ، عن ابي هریرة ﷺ مرفوعاً٠

[٣٨٨] أخرجه: مسلم ((الصحیح)) (٢٨٣٧) ، واحمد ((المسند)) (٣١٩/٢) ، والترمذي ((السنن)) (٣٢٤٦) ٠

[٣٨٩] أخرجه:الترمذي ((السنن))(١٦٥١)وقال: حدیث صحیح، وصححه الشیخ الالباني في ((صحیح سنن الترمذي)) (١٣٤٥).

**لتزخرفت له مابين خوافق السماوات والارض ، ولو ان رجلاً من أهل الجنة اطلع فبدا اساوره لطمس ضوء الشمس كما تطمس الشمس ضوء النجوم))** [٣٩٠] .

واتە : ((گەر بەوێنەی سەرە نینۆکێك لەوەی لە بەهەشتدا هەیە دەرکەوێت نێوانی هەموو ئاسمانەکان و زەوی ڕووناك دەکاتەوە ، وە گەر پیاوێك لە خەڵکی بەهەشت خۆی نیشان بدات و تەنها یەك بازن لە بازنەکانی دەرکەوێت ، ڕووناکی بازنەکەی ڕووناکی ڕۆژ دەسڕێتەوە ، وەك چۆن ڕووناکی ڕۆژ ڕوناکی ئەستێرەکان دەسڕێتەوە )).

وە هەروەها ئەگەر یەك پیاو لە پلە بەرزەکان لە بەهەشت دا ڕووناکی ڕوخساری دەرکەوێت بەهەشت ڕووناك دەکاتەوە ·

لەکەعبی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەفەرموێت : **((... ان الرجل من أهل الجنة ليخرج فيسير في ملكه فلا تبقي خيمة من خيم الجنة الا دخلها من ضوء وجهه فيستبشرون بريحه ، فيقولون : واهاً لهذا الريح ، هذا رجل من أهل عليين قد خرج يسير في ملكه ...))** [٣٩١] واتە : ((گەر یەکێك لەپیاوە خاوەن پلە بەرزەکانی بەهەشت دەرچێت و بەناو موڵکەکەیدا بگەڕێت کۆشکێك نامێنێت لەکۆشك و تەلارەکانی ناو بەهەشت هەر هەموو ڕووناکی ڕوخساری ئەو کەسە دەچێتە ناویەوە و بەهەشتیەکانی تر دەڵێن : ئای لەو بۆنە چەند خۆشە ئەوە پیاوێکە لە خاوەن پلە بەرزەکانی (علیین) چوەتە دەرەوە و بەموڵکەکەیدا دەگەڕێت ...)). نیعمەتەکانی دونیا لە چاو نیعمەتەکانی بەهەشت ، وەك دەرهێنانی پەنجەیەك وایە لەناو دەریایەکی فراوان دا و لەگەڵ پەنجەکەدا تەنها تنۆکێك ئاو دێتەدەرەوە ... لەموستەوردی کوڕی شەدادەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((والله ما الدنيا في الاخرة الا مثل ما يجعل**

---

[٣٩٠] أخرجه : أحمد ((المسند)) (١٤٤٩) وقال الشيخ الارناؤوط في تحقيقه: حسن ، والترمذي ((السنن)) (٢٥٣٨) وقال حديث غريب ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٠٦١) ، وفي ((المشكاة)) (٥٦٣٧)، و ((الصحيحة))(٣٣٩٦).

[٣٩١] أخرجه: الطبراني ((المعجم الكبير)) (٩٧٦٣) ، والحاكم ((المستدرك)) (٣٧٦/٢) صححه ووافقه الذهبي و(٥٩٠/٤) ، أخرجه عبدالله بن احمد ((كتاب السنة)) (١٢٠٣) وقال محققه إسناده حسن ، وصححه الشيخ الألباني في ((مختصر الطحاوية)) (ص: ٢٦٤) ، وفي ((مختصر العلو)) (٦٩) (ص: ١١٠) ، وكذلك صححه الشيخ الارناؤوط في ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٦٠٦/٢) وقال :حديث صحيح...

**احدكم اصبعه في اليم فلينظر بم ترجع اليـه))** [٣٩٢] واتـه: (( وەلاهـی دونیـا لەئاسـتی ڕۆژی کۆتایدا وەك ئەوە وایە یەکێکتان پەنجەی بکاتە ناو دەریایەکەوە و پاشان تەماشا بکات پەنجەی چی لەگەڵ خۆیدا دێنێتە دەرەوە)) گەر هەژار ترین و داماوترین کەسی دونیا یـەك جـار تـەنها بکرێت بەناو بەهەشتدا هەر هەموو ناڕەحەتیەکانی دونیای لەبیر دەچێتەوە ...

ئەنەس ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((.. **یـؤتی باشـد النـاس بؤسـاً في الدنيا من أهل الجنة فيصبغ صبغة في الجنة ، فيقال له : يا ابن ادم هل رأيت بؤساً قط ؟ هـل مرّ بك من شدة قـط ؟ فيقـول : لا والله يـارب مـا مـر بـي بـؤس قـط ، ولا رأيـت شـدة قط))** [٣٩٣]. واته: ((هەژارترین کەسی خەڵکی دونیا دەهێنرێت و هەڵدەکێشرێت لە بەهەشـتدا و پێی دەوترێت ئەی ئادەمیزاد ئایا هەرگیز لەژیانتدا ناڕەحەتیت بەسەردا هاتووە ؟ ئایا لە ژیاندا هەرگیز هەژاریت بەخۆوە بینیوە؟ ئەویش دەڵێـت : نـەخێر وەلاهـی ئـەی پـەروەردگار هـەرگیز ناڕەحەتیم نەدیوە وە هەرگیز هەژاریم بەسەردا نەهاتووە)) .

لەبەر ئەوە هەریەکێك لە خەڵکی بەهەشـت گـەر هـەموو دونیـای بـدرێتێ و دە بەرانبـەری دونیاش ، بەهیچ شێوەیەك پێی خۆش نی یە بگەڕێتەوە بۆ دونیا ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : **((مامن أحد يدخل الجنة يحب ان يرجع الى الدنيا وان له ما على الارض من شـئ .. ))** [٣٩٤] واته : (( هەرکەسێك بچێتە ناوبەهەشتەوە پێی خۆش نی یە بگەڕێتەوە بۆ دونیـا گـەر هـەموو شتانی سەر زەویشی بدرێتێ...)) .

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : **((ما من أهل الجنة أحد يـسره أن يرجـع الى الـدنيا ولـه عشرة أمثالها ...))** [٣٩٥].واته: (( هیچ کەسێك لەخەڵکی بەهەشت پێی خۆش نی یە بگەڕێتـەوە بۆ دونیا گەر دەئەوەندەی دونیاشی پێببەخشرێت ...)).

---

[٣٩٢] أخرجه : احمد ((المسند)) (٤/٢٢٩) واللفظ له، ومسلم ((الصحيح)) (٢٨٥٨) ، وابن ماجة ((السنن)) (٤١٠٨) وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٣١٦).

[٣٩٣] أخرجه : مسلم ((الصحيح)) (١٧/١٤٩) ((شرح النووى)).

[٣٩٤] اخرجه : احمد ((المسند)) (٣/١٠٣) ، والبخاري ((الصحيح)) (٢٨١٧) ، ومسلم ((الصحيح)) (١٨٧٧) واللفظ له.

[٣٩٥] اخرجه : ابن حبان ((الصحيح)) (٧٤٥٢) وقال محققه : اسناده صحيح على شرط الشيخين .

# بەهەشت گرانە و ڕێگاکەشی سەختە

خوای گەورە بەهەشتی بەناڕەحەتی یەکان و کردەوە قورسەکان دەورە داوە کە بەناڕەحەتی خەڵکی دەیگەنێ و دەچنە ناوی مەگەر خوای گەورە ڕێگەیان بۆئاسان بکات:-

ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((لما خلق الله الجنة والنار ، أرسل جبريل عليه السلام الى الجنة ، فقال : (اذهب) فانظر اليها والى ما أعددت لأهلها فيها ، (قال : فجاءها) ، فنظر اليها والى ما أعد الله لأهلها فيها ،فرجع اليه ،فقال : (أي رب) وعزتك لايسمع بها أحد الا دخلها، فأمر بها فحفت بالمكاره (ثم قال : يا جبري): (ارجع اليه) فقال : وعزتك لقد خشيت ان لايدخلها أحد ، قال : اذهب الى النار [فانظر اليها] و الى ما اعددتُ لأهلها فيها فنظر اليها ، فاذا هي يركب بعضها بعضاً ، فرجع : (اليه) فقال : وعزتك (لا يسمع بها احد فيدخلها) فامر بها فحفّت بالشهوات ، فقال : ارجع فانظر اليها (فرجع) فنظر اليها ، فاذا هي قد حفّت بالشهوات ، فرجع وقال :( أي رب) و عزّتك لقد خشيت ان لاينجو منها أحد الا دخلها (في رواية : لقد خشيت أن لايبقى أحد الا دخلها))[٣٩٦] .واتە : ((کاتێ خوای گەورە بەهەشت و دۆزەخی دروست کرد جبریل ی نارد بۆ بەهەشت و پێی فەرموو (بڕۆ) سەیری بەهەشت بکەو تەماشای ئەو هەموو نیعمەتانەش بکە کە بۆ خەڵکەکانیم ئامادە کردووە ،(ئەنجا ڕۆیشت بۆ بەهەشت ) ، و سەیری کردو تەماشای ئەوەشی کرد کە بۆ خەڵکەکەی ئامادە کراوە و پاشان گەڕایەوە و ووتی : (ئەی پەروەردگار) سوێند بەعیزەتی تۆ هەریەکێك باسی بەهەشتی گوێ لێبێت هەر دەچێتە ناوی و هەوڵی بۆ دەدات ،خوای گەورە فەرمانیدا چی ناڕەحەتی هەیە دابنرێت بەچوار دەوری بەهەشت (پاشان فەرمووی : ئەی جبریل : (بگەڕێوە و تەماشای بکەرەوە) ئەنجا گەڕایەوەو سەیری بەهەشتی کرد بینی دەوری گیراوە بەناڕەحەتی یەکان [گەڕایەوە بۆلای خوای پەروەردگار ]و ووتی : سوێند بە عیزەتت ترساوم لەوەی کە هیچ کەس نەچێتە ناوی ، پاشان خوای گەورە

---

[٣٩٦] اخرجه : احمد ((المسند)) (٣٣٣/٢) ، وابو داود ((السنن)) (٤٧٤٤) ، والنسائى ((السنن)) (٣/٧) ، والترمذي ((السنن)) (٢٥٦٠) ، وقال ابن الحجر ((الفتح)) (٣٩٦/٦) : اسناده قوى ، و صححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن النسائي)) رقم : (٣٥٢٣) ، وفي ((صحيح سنن الترمذي)) رقم (٢٠٧٥) ، وفي ((المشكاة)) (٥٦٥٩) .

فەرمووی : بەرەو لای دۆزەخ بچۆ [سەیری بکە] و تەماشای ئەوانەبکە کە تیایدا ئامادەم کردووە بۆ دۆزەخیەکان ، ئەویش چوو تەماشای دۆزەخی کرد ئاگر بەسەر ئاگر دا دەکەوێت ، گەڕایەوە (بۆلای خوای گەورە) ووتی: سوێند بەعیزەتی تۆ (هەرکەس ناوی دۆزەخ ببیستێت هەرگیز توخنی دۆزەخ ناکەوێت و حەز ناکات بچێتە ناوی) خوای گەورە فەرمانی دا کەچوار دەوری دۆزەخ بەحەزو ئارەزوەکان دەورە بدرێت ، خوای پەروەردگار فەرمووی : بگەڕێرەوە بچۆ تەماشای دۆزەخ بکەرەوە (ئەویش گەڕایەوە) و بینی دەوری گیراوە بەحەزو ئارەزوەکان ئەنجا گەڕایەوەو ووتی (ئەی پەروەردگار) سوێند بە شکۆمەندیت ترساوم لەوەی هەموو بچنە دۆزەخ و هیچ کەسێك ڕزگاری نەبێت لیّ ی (لەڕیوایەتێکی تردا : ترساوم لەوەی هەموو بچنە ناوی و یەك کەس نەمێنێت کەنەچێتە ناوی )).

لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر موسوڵمان بەردەوام بێت لە ئەنجام دانی کاری چاکە کەببێتە هۆیەك بۆ چونە ناوبەهەشت وەکو نوێژو ڕۆژوو گوێ ڕایەڵی دایك و باوك و ترسان لەخواو......هتد .

ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((من خاف أدلج ومن أدلج بلغ المنزل ، الا ان سلعة الله غالية ، الا ان سلعة الله الجنة ))[٣٩٧] واتە : (( هەرکەسێك بترسێت لەڕێگە ناحەوێتەوە و هەربەڕێ دەکەوێت و شەو ڕەوی دەکات تاکو لەو ناڕەحەتیانە ڕزگاری ببێت وە هەرکەسێکیش نەخەوێت و شەو بەڕێوە بێت بێگومان دەگاتە شوێنی مەبەستی خۆی ئێوە بەئاگا بن ئەو کاڵایەی خوای گەورە پێتان دەبەخشێت گران بەهایە بەئاگابن کاڵای خوای گەورە بەهەشتە)).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((مفتاح الجنة الصلاة ، ومفتاح الصلاة الوضوء))[٣٩٨] واتە : (( کلیلی بەهەشت نوێژە وەکیلی نوێژیش دەست نوێژە)).پێویستە لەسەرمان پارێزگاری لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بکەین وە هەروەها ڕۆژووی ڕۆژی دووشەممان و پێنج شەممان . چونکە

---

[٣٩٧] اخرجه : الترمذي ((السنن)) (٢٤٥٠) ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٩٣) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٦٢٢٢) ، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٩٥٤) ، وفي ((المشكاة)) (٥٣٤٨).

[٣٩٨] اخرجه : احمد ((المسند))(٣/٣٤٠) ،والطبراني((المعجم الصغير)) (٥٩٦) ، والطيالسي((المسند)) (٢٧١٢) ، والبيهقي ((شعب الايمان)) (٢٧١١) ، والترمذي ((السنن)) (٤) ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٤).

دەرگاكانی بەهەشت لەو ڕۆژانەدا دەكرێتەوە پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێت: ((اذا كـان اول ليلـة من شهر رمضان : صفدت الشياطين و مردة الجن ، وغلّقت أبواب النيران فلم يفـتح منهـا باب ، وفتحت أبواب الجنة فلم يغلق منها باب ، وينادي مناد : يا باغي الخـير اقبـل ، ويـا باغي الشر اقـصر ...))[٣٩٩] واتە: (( كەیەكەم شەوی مانگی ڕەمەزان دێت شەیتانە گەورەكان و ماریدە جینەكان دەبەسترێنەوە وە دەرگاكانی دۆزەخ دادەخـرێن و یـەك دەرگـای ناكرێتـەوە و دەرگاكانی بەهەشت دەكرێنە سەر پشت و یەك دەرگای داناخرێت وەبانگ دەرێك بانگ دەكـات ئەی ئەو كەسانەی كە بەدوای چاكەدا دەگەڕێن ئەوا دەرگای بەهەشت كراوەتەوە بۆ چاكە كـردن وە ئەی ئەو كەسانەی كە بەدوای خراپەدا وێڵن وازبهێنن و بگەڕێنەوە ...)).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ((تفتح أبواب الجنـة يـوم الاثـنين والخمـيس ...))[٤٠٠] واتە: (( دەرگاكانی بەهەشت ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممە دەكرێنەوە )).

## نەمری خەڵكی بەهەشت

خەڵكی بەهەشت بەهەتا هەتای لـەناو بەهەشـتدا دەمێننـەوە و نـامرن وە هـیچ كـات لـە بەهەشت دەرناكرێت ، وەكو خوای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ ﴿٤٨﴾ ﴾ (الحجر: ٤٨).

وە لە ڕۆژی قیامەتدا مردن لە وێنەی بەرانێكدا دەهێنرێت وە فەرمان دەكرێت بەسەر بڕینـی وە هـەردوو كۆمـەڵی بەهەشـت و دۆزەخ بـە هـەتا هـەتایی دەمێننـەوە، وەكـو پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێت : (اذا أدخل الله تعالى أهل الجنة الجنة ، وأهل النار النار ، اتي بالموت ملبّباً* (في صورة كبش أملح*) (حتى يوّقف) على السور الذي بين أهل الجنة وأهل النار ، ثـم يقـال :

[٣٩٩] اخرجه : الترمذي ((السنن)) (٦٨٢) ، وابن ماجة ((السنن)) رقم (١٦٤٢) ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٥٤٩) ، وفي ((صحيح ابن ماجة)) (١٣٣١).

[٤٠٠] اخرجه : البخاري ((الادب المفرد)) (٤١١) ، ومسلم (٢٥٦٥)، وابن حبان ((الصحيح)) (٥٦٦٣) وقال محققه اسنادة على شرط مسلم ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الادب المفرد)) (٣١٨) ، وفي ((الارواء الغليل)) (٩٤٨) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٢٩٧٠) ، وفي ((غاية المرام)) (٤١٢).

* ملبباً : مقيداً .

* املح : هي النقي البياض او الذي بياضه اكثر من سواده . انظر : (( النهاية)) (٤/ ٣٥٤ ) .

